# موناجات

سەیدی هەورامی

یا حەی بێ‌چوون ، یا حەی بێ‌چوون
یا حەی بێ مەسەل بێ هەمتای بێ‌چوون
یا فەرمانفەرمای ئەمر کاف و نوون
کەریمی کارساز بە "کن فیکون"
چون تۆ نادرسونع کەسێ وتەرجەکۆن
قادر هەر تۆنی، نادر سونع تۆن
هەفت ئاسمانان چەنێ ستاران
بەرزی بێ ستووت وەپات و ناران
موعەللەق وەبان ئەوان کورسی و عەڕش
زەمینت بەدەست قودرەت کەردەن فەڕش
کی دارۆ قودرەت سازۆ غەیر جەتۆ
رۆشنی زوڵمات شەوان چەنی رۆ
یاکێ قودڕەتش جە لەیلی دەیجوور
سوب کەرۆ سفید بەرۆ بدۆ نوور
یا خوکێ تاوان ، هەر شام، هەر سەحەر
شەوق بدۆ بەمانگ یا نوور دۆ بەخوەر
یاکێ بەرمارۆ حەی بێ زەواڵ
جە سەنگی خارا ، سەرچشمەی زوڵاڵ
کێ جە ناف خار بەر ماوەرۆ گوڵ
کێ مەوزۆ عشقش نە کەڵڵەی بولبول
یەکشت کەردەی تۆن فەرد بێ شەریک
گەر بۆیۆ یۆتەر مەمانۆ خەریک
مەزانۆ هەر کەس تۆش بە حەق ناسان
کاران گشت بەدەست تۆ مەبان ئاسان
ئوستای سەنعەت خاس،هەرکەس تۆش یادەن
حەق ناس دڵ پاک ،موئمن هەر ئادەن
یاد تۆن رەفیق شەو زیندەداران
تۆنی یارشان ،شەو بەرۆ ماران
کانی سەخا و جوود کەرەمدار تۆنی
رەزاق پای مەخلووق هەرڕو هەرتۆنی

تۆ بە خوان جوود ،رۆزیت دان قەرار
ئینس و جین وتەیر ، مەل و موورو ماڕ
هەرچەند زیرۆح ، رۆش نەحەیاتەن
یەکسەر تەسبیحی گویای سەناتەن
بولبول بە نەغمەی هەزار دەستانش
زیکر نام تۆ ویردی زوبانش
کەبکێ کۆکوان جە کۆساروەوە
کووکووی قومری یان وە جۆبارەوە
حەمدەن ،تەسبێحەن،سەنای زات تۆن
نام تۆ شان ویرد، شەوان تا وەرۆن
ئەر عالم ئەر شێخ ئەر پڕکەماڵەن
زوانش جە وەسف سەنای تو لاڵەن
ئێمە گرد بەندەی خەتاکارنیمی
جە خەتابای گران بارنیمی
ئومێدمان بە عەفو بێ سامان تۆن
وەرنە کەردەی نیک جەلای ئێمە کۆن
بەڵێ تۆ کەریم کەرەم دارەنی
ستارالعیوب هەم غەففارەنی
تۆ خەتا ئامورز، گوناە بەخشەنی
بەخشندەی بێ باک ، دڵ نەلەخشەنی
هەرچەند گوناکار، گوناش فیشتەرەن
تیغ عەفو تۆ بڕا و تیژتەرەن
پەرێ بەدی مان عەفوت تەلافین
لوتف عام تۆ پەی گشتین کافین
خسووس پەرێ من ، گوناکار تەرم
جە مایەی عوسیان سەنگین بارتەرم
نامەی ئەعمالم جە عوسیان ، سیان
داغمەی بەدبەختیم بەدڵ دانیان
یا غافرالذنب سڕپوشی سەتتار
بویەر جە جورمی سەیدی خەتاکار

وێنەی رووبەرگ
دیاری کاک بەهمەن مەتلووب

وێنەی پشت بەرگ
دیاری کاک کەماڵ تاتایی



ارومیه: چهارراه دانش - جنب ژاندارمری - انتشارات صلاح الدین ایوبی - صندوق پستی ٧١٧

**فۆرمی ئابوونمان**

ژمارە

ناو ............شۆرەت ..............دانیشتووی .......................

....... تمەنم بەحیسابی ژمارە ٥٤٠٠ ی شوعبەی ناوەندی بانکی سپەی ورمێ گرت و

فیشەکەم وێرای ئەم بەرگە بۆ ناردن. لەژمارە ........را هەتا ......گۆواری سروەم

بۆ بەرێ بکەن.

ناونیشان ...........................................

.......................................................

سڵاو لە خوێنەرانی بەڕێز و بە ئاواتی سەرکەوتن و ساغی و سلامەتی بۆ تاکە تاکەی ئازیزانمان .

گەڕانەوەی ساڵی تازە ، لە هەموو خوشک وبرایان بەتایبەتی ئەوانەی لەم جووڵانەوە فەرهەنگی یەدا یارمەتی یان داوین پیرۆزبایی دەکەین . ئەوانەی کەبە ناردنی بابەت و پێشنیار و ڕەخنە ڕێگەیان پێشانداوین و هەموو ژن و پیاوی ئەم هەرێمە پیرۆزە کە میراتی خۆشەویستی و داوێن پاکی و ڕەحمەت و دلاوایی و ڕەسەنی یان بەکوڵەوەیە نەورۆزیان لێ پیرۆز بێ .

ساڵێک نوێ دەبێتەوە ئاڵ و گۆڕێکی هەرا و بەسەر تەبیعەت و نیزامی گێتی دا دێ.دیمەنی دەشت و سەحرا دەگۆڕێ . دۆڵ و دەرە و ڕژد و هەڵدێر ، دار و درەخت و گوڵ و گیا ،دەڕازێنەوە. ئەم تازە بوونەوە ،ئەمگۆڕانە بێ پایانە کە دیمەنی تازە و نوێ بە هەموو ئافەریدەیەک دەبەخشێ ،بۆبەرەی ئادەمیزا ـ دیش کە سەرتۆپی هەموو گیان لەبەرانە هەلی ڕاپەڕین و وەخوهاتنەوەیە . هەتا کوو ژیانێکی خاوێن وجوانتر دەست پێ بکا و بەرنامەی باشتر بۆ ژیانی ساڵی تازەی دارێژێ .

لە بەهاردا زەبرو زەنگی سەرما نامێنێ .ڕەشەبای ساردو سڕ کەهەموو شتی هەڵدەوەراند و دژی گەشە وهەڵدانی هەموو جەشنە جوانی یەک بوو ئێستا بۆتە شنەی بلاوێنی دڵ بزوێن و گوڵ وگوڵ خونچەو چڵ و پۆپی دار و گوڵ دەلاوێنێتەوە ، و هەرێمی ژین هێمنە وکەیلی وەفا و سەفایە وبەرەنگ و تروسکەی جوانی ڕازاوەتەوە ، ئەوە سەرمەشقێکە بۆئێمە وەک بەهار وەک سروشت ، ئێمەش با ماڵە ویرانەکەی دڵ خاوێن کەینەوە ، کینە و دڵێشە و ناکۆکی لێ داماڵین وبیکەینە هێلانەی دۆستی و برایەتی و بە ئاڵ و واڵی خۆشەویستی و ئەوین بیڕازێنینەوە . دەستی دۆستی بۆ خزم وئاشنا ودەروجیران و هاوکار و هەمووکەس درێژکەین یەک بگرینەوە ،پەیمان تازە کەینەوە و خۆمان بۆ خزمەت کردنی ئایین وولات وکۆمەڵمان هەڵبڕینەوە .

بەکورتی ئەمرۆ " بەهارە " دەبا جوانترینەکان وباشتر ـ ینەکان بخەینە کایەوە و هەرە باشەکان بکەین بەدیاری بۆ گەلەکەمان .با "هەرەخاسەکان " ئاشکرا بن و دەسەلاتیان بدەینە دەست . دەجا دەی هەرچی بە

---

جون خۆشەویستان ولایەنگرانی سروە لە دەروژووری ولات بە نامەی جوان ورازاوە داوای "فۆرمی ئابوونمان"یان کردووە ، ئەوە چۆنەتی ئابوونمان لە دەروژووری ولات بەو شێوە ڕادەگەیەنین

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| نرخی | ١٢ | ژمارە بۆنێو خۆی ولات | ٢٠٠ | تمەن |
| نرخی | ١٢ | ژمارە بۆ ولاتە دراوسێکان | ٣٨٠ | تمەن |
| نرخی | ١٢ | ژمارە بۆ هیند وئورووپا | ٤٣٠ | تمەن |
| نرخی | ١٢ | ژمارە بۆئامریکا وخاوەری دوور | ٥٠٠ | تمەن |

ناونیشان : اورمیه ـ صندوق پستی ٧١٧ ـ انتشارات صلاح الدین ایوبی ـ تلفن ٣٥٨٠٠

بۆ ئەم خوێندکارانە کە لە زانستگاکانی دەرەوە دەخوێنن ( ئەگەر بەڵگەی خوێندکاری خۆیان بنێرن ) هەل و مەرجێک پێک دێنن کە گۆواری سروەیان بەنیوە قیمەت پێ بگا .

خۆتی ڕەوا دەبینی بە خەڵکی دیکەشی ڕەوا ببینە ئەوەی بۆ خۆتت ناوێ بۆ کەسی دیکەشت نەوێ .

لایەنگران و هاوکارانی سروە .

هەروەک لەدوایین ژمارەی ساڵی دووەمی سروەدا بەڵێنمان دابوو تەقەلای کاربەدەستانی گۆوارەکەمان ئەوەیە کەلەمەو، دوا سروە ببێتە مانگانە . ئەم ئەرکە هەرچەند لە بەرامبەر سێڵاوی داخوازی لایەنگرانی خۆشەویستماندا هەنگاوێکی چووکە بەڵام لە هەل ومەرجی ئێستادا بۆ ئێمە بازدانێکی بڵێندە . هاوکارانی ئێمە لە کۆڕی نووسەران وکادری وەرگێڕان و تایپ و گرافیکدا سوورن لەسەر دابینکردنی ئەم داخوازیانە و ئێستا هەر ئەم ژمارەی بە دەستانەوەیەژمارەی یەکەمی "سروەی مانگانەیە" . هیوامان وایە بتوانین بەڵێنی مان بەرینەسەر و سروە هەر بەمانگانە بڵاو بێتەوە . هەر وەک دەبینن بەهۆی بوونە مانگانەوە ژمارەی لاپەڕەی گۆوارەکەمان کەم بۆتەوە و ئەوەش چەند هۆیەکی گرینگی هەیە کە بۆ ئاگاداری ئێوەی خۆشەویست باسی لێ دەکەین .

یەکەم ئەوەیەکەمچاپخانەکان بۆ جوزوبەندی (صحافی) گۆواری سەت لاپەڕەیی بەرەنگاری زۆر گیروگرفتن و لە رابردوودا ، ئەغلەب هۆی دواکەوتنی گۆوارەکەمان بووە. ئەوجار لە ماوەی مانگێکدا بۆگۆوارێکی مانگانە کەدە ڕۆژی بۆ چاپ و ناردنی بۆشارەکان تەرخان دەکرێ ،ئامادەکردن و تایپ و گرافیک و دابین کردنی هەموو کاری پێویست زۆر ئەستەمە و ناتوانین بابەتی زۆرتر ئامادە و ئاراستە بکەین . هۆیەکی دیکەشی ئەوەیە کە بابەتی جۆراوجۆرمان بەتێرایی گۆوار پێ ناگا یا بۆ چاپ نابێ. بە لەبەر چاوگرتنی ئەو مەسەلە، کەباسی فەرهەنگی وکۆمەڵایەتی وئاینی بۆ ئێمە زۆرپێویستە

ئەڵبەت ئێمەش لەباری کەمکردنەوەی ژمارەی لاپەڕەکان لەگەڵ خاوەنڕایانی لایەنگری سروە ڕاوێژمان کردووە کەهەموویان لەسەر ئەو کارە، ڕایان داوە .

لە کۆتاییدا ئارەزوومان ئەوەیە کە هەمیشە گۆوارێکی بە نیوەرۆک و تام و چێژتان پێشکەش بکەین وسروە ئاوێنەی بالانوێنی بیروباوەڕی خاوێن و ڕەسەنی خەڵکی ئەم وڵاتە بێ و لەودا تازەترین وپێشکەوتوا ـ نەترین بیروڕای ئێوە ڕەنگ بداتەوە . بۆ گەیشتن بەم ئامانجە ئێوەی بەڕێزن کە دەتوانن بەناردنی ڕێنوێنی و پێشنیاری باش و بە کەلک یارمەتیمان بدەن .

بەدووپاتکردنەوەی پیرۆز بایی نەورۆز لەخوای مەزن داوا دەکەین کە باشترین هەل و مەرجی گەیشتن بەم لوتکەی پێگەیشتوویی وتێگەیشتوویمان بۆ پێک بێنێ .

# سرمقاله

بسمه‌تعالی

باسلامی گرم بەخوانندگان محترم وبا آرزوی سلامت برای یکایک شما عزیزان .

فرارسیدن سال نورا بەهمه برادران وخواهرانی کەدراین حرکت فرهنگی مارایاری دادەاند وبا استقبالشان از سروه وارسال مطالب ، انتقادات ، پیشنهادات جهت بخشمان بودندو نیز بەهمه مردان و زنانی که دراین دیارِ پاک میراث شرافت نجابت ،عفت ،رحمت وخلاصه همه خوبیهای بجامانده ازگذشتگان را بردوش میکشند تبریک میگوئیم .سال نو فرا میرسد و تحولی بزرگ وبنیانی همه طبیعت ونظام احسن آفرینش را دربر میگیرد. تحولی که تغییر چهره دشت ودمن ، کوه و دره ، درخت وگل و... تنها اشارەای بیش بەاین حقیقت بزرگ نیست این دگرگونی همچنانکه زندگی همه موجودات را از یکنواختی بدرمیآورد وبەحیات همه جلوەای نو ومعنی میبخشد ، غنیمت فرصتی است برای اشرف مخلوقات تا با بهرەگیری از

آن از غفلتها بدرآمده و با استفاده از تجربه‌هایی که‌کسب کرده زندگی سالمتروسعادتمندتری را آغاز نماید. اینکه در بهار ازخشونت سرما خبری نیست وباد سردی که مامور بود همه‌چیز را بخشکاند اکنون به نوازش گل وگیاه مشغول میشود و همه‌دست بدست هم میدهند تا محیطی پر ازصفا و صمیمیت طراوت وزیبایی و .... بسازند. درسی است به‌ما که‌کینه،کدورتها و..رایکباره ازقلبها خارج کنیم ودست دوستی به‌سوی آشنا و فامیل وهمسایه وهمکار و ..... دراز کنیم ووحدت و تلاشی مشترک برای خدمت دین ومیهن و جامعه باهم بیعتی دوباره کنیم.

خلاصه بهار است و باید "به" آوری وباید به بهترین اندیشه‌ها عمل کنی وبهترینهای خود رادر تحقیق این همکاری بکارگیری و بهترین هدیه‌ها را تقدیم دیگران کنی وبهترین راآشکار و حاکم کنی واز هرچه "به" نیست بپرهیزی و آنچه راکه "به" میدانی و برای خود بپسندیده میداری برای دیگران بپسندی. دراین باب سخن بسیار است و مجال کم و تو خود حدیث مفصل بخوان از این مجمل

دوستداران وهمکاران سروه:

چنانکه درآخرین شماره سال دوم وعده داده بودیم تلاش دست اندرکاران نشر "سروه" براین است که از این پس "سروه" بصورت ماهانه انتشار یابد و همچنانکه در شماره پیش اعلام شد اینکار هرچند در برابر سیل تقاضاهای مکرر شما دوستان اقدامی کوچک است لیکن درشرایط حاضر برای ما گامی بزرگ است. برادران هیئت تحریریه وکادر ترجمه وتایپ و گرافیک وصفحه‌پردازی عزم‌جزم کرده‌اند تا این خواسته بحق را تحقق بخشند واکنون این شماره نیز بعنوان اولین مجله ماهانه چاپ ومنتشر شده است و ما امیدواریم که‌در حفظ ماهانه‌بودن سروه به‌موفقیت دست یابیم. چنانکه ملاحظه میکنید باتوجه به ماهانه‌شدن سروه ازمیزان صفحات آن کاسته شده که این خود چند علت دارد نخست آنکه چاپخانه‌ها درصحافی نشریه با مشکل مواجه بوده و لذا انتشار نشریه با تاخیر مواجه میشود. دیگر آنکه در مدت بیست روزی که برای آماده‌کردن مطالب تا صفحه‌پردازی وگرافیک فرصت هست امکان آماده‌سازی مطالب بیشتر نیست ناگفته‌نماند که از مدت سی روز حداقل ده روز آن به‌چاپ و ارسال آن به‌شهرها میگذرد و بدین ترتیب نمیتوان بیشتر از این انتظار داشت ودیگر آنکه نبود نوع کافی درمطالب مفید وقابل چاپی که از سوی خوانندگان محترم بدست ما میرسد علت دیگری بر کاهش صفحات نشریه ماهانه است. البته دوستداران سروه نیز به این مطلب عنایت داشتند و اکثرا" درضمن پیشنهاد ماهانه کردن نشریه بلا اشکال بودن کاهش صفحات آن را مورد تاکید قرار داده‌اند.

فی الجمله آرزوی ما این است که درحداقل زمان ممکن پرمحتواترین نشریه را خدمت شما تقدیم کنیم تا سروه بعنوان آئینه‌تمام‌نمای افکار واندیشه‌های ناب وخالص این خطه از میهن عزیزمان ومنعکس‌کننده تازه‌ترین نظرات، پیشنهادات، و ارشادات شما باشد. و این ممکن نیست مگر آنکه شما عزیزان بیش ازپیش با ارسال مطالب، نظریات و پیشنهادات یاریمان کنید. بحث لازم دیگری بود تحت عنوان "تنوع مطالب وحفظ هویت اصل و خط اصلی سروه" که به جهت محدودبودن صفحات سرمقاله آنرا به شماره آینده موکول میکنیم. دراینجا مجددا" باتبریک فرارسیدن سال نو ازخداوند بزرگ میخواهیم که بهترین شرایط را برای نیل به‌کمال ورشد و سعادت نصیبمان کند.

# شۆڕشی موحەممەد

م .خالەق

ژیانی " محمدابن عبداللّه" پێغەمبەری ئیسلام دروودی خوای لەسەربێ هەمووی وەقفی تێک شکاندنی تاغووتان بوو حاچ تێکشکاندنی ئەو تاغووتانەی کە لە ویژدان و دەروونی ئادەمیزاددا هەن یا ئەو تاغووتانەی کە لە سەر دنیا و لە مەیدانی ژیندا هەن وبەرچاون. لە درێژایی مێژوودا کەسمان پێ شک نایە کە وەک محەممەد (د.خ) قۆلّی لە تاغووت شکاندن هەلّمالّیبێ و لە تەمەنی کورتی ژیانیدا ئەو هەموو هێزە تاغووتیانە تێکەوە پێچێ.

رێبازی محەممەد (د.خ)رێبازێکی شۆڕشگێڕـ انە و رزگاریخوازانە بوو کە بۆ هەموبەرەی ئادەمیزاد پێک هاتبوو. ئەم شۆڕشە مەزنە داگری هەموو لایەنەکانی ژیانی ئینسان بوو . چونکە لەگەلّ هەر چەشنە تاغووتێک لە چوار گۆشەی دنیادا بەرەنگاری دەکرد.

ئەو شۆڕشە قوولّە تاغووتی " شەریک بۆ خودا دانانی" تێک شکاند و ژەنگی شیرکی لە ئاوێنەی بیروباوەڕی ئادەمیزاد سڕیەوە و یەگانەگی زاتی باری بە ئینسان سەلماند.

پێش هاتنی ئەو زاتە بێ وێنەیە زۆرئایینی تەوحیدی هاتبوون و پێغەمبەری مەزن تێکۆشابوون کە هەوری رەشی شیرک لەناوبەرن. پێغەمبەرەکان سەلامی خوایان لەسەربێ ئەو پەڕی خەباتیان بۆروون کردنەوەی ئادەمیزادی ئەو سەردەمە گێڕا . بەلاّم بەرهەمی کاریان زۆر هەراو نەبوو و بەرەی مرۆڤ بەشی زۆری هەر لە تاریکایی دا مانەوە و هەر گەل و هۆزێک بە سەلیقە وبۆچوونی خۆی خودایەکی تایبەتی باندا تاشی بوو.

تەشەر وتانەی پیاوانی ئایینی کارێکی لە سەر خەلّک نەدەکرد . نەو یەیکەرانەی جەماوەری خەلّک بە خودایان دەزانین تێک نەدەشکان .تاغووتی شەریک بۆخودادانان هەر بەردەوام بوو. مەزهەب و ئایینی درۆزنانەکە بە حل وبەرگی جوان رازابوونەوە و رەنگی پاکی وروحانییان تێهەلّسوورابوو پەرەیان

ئەستاند و ئەوەی کە ئایین وریباری خودایی بێ رەچاو نەدەکرا .

تاغووتێکی دیکە کە بە هاتنی خاتەمی پێغەمبەران (د.خ) تێک شکا ،تاغووتی "تعصب" بوو .شۆڕشی ئیسلام لەگەڵ هەموو رواڵەتێکی " تعصب" بەربەرەکانی دەکرد. کە یەکێک لەم "تعصب"انە "تعصب"ی ئایینی بوو .دیسان ئیسلام بەگژ "تعصب"ی نەژاد و رەنگدا چوو وهێرشی کردە سەر هەموو جیاوازی و خۆبەزل زانینێک کە بە ناوی رەنگ یا نەژاد لە ئارادا بوو . چونکە ئیسلام بە ئاشکرا رایگەیاندووە کە بەرەی ئادەمیزاد لە یەک بنەما وسەرچاوەڕا هاتوون وجیاوازییان لەگەڵ یەکدی نیە .

ئیسلام بیروبڕوای خۆ بە زل زانین و گەورەیی بە بۆنەی ئەوە کەنەژاد یا رەنگ دەبنە هۆی گەورەیی و جیاوازی رەپێچەکداولە ناوی برد وپێوانەی تایبەتی بۆ گەورەیی و سەروەری دانا . ئەم پێوانەیەش نەپێوەندی بە رەنگەوە بوو نە بە نەژاد و خێڵ و هۆز و بنەماڵە و بنەچەکەو زمان وزێدەوە. پێوانەی گەورەیی وفەزیلەت ،پارێز وتەقوا و ئیتاعەی "الله" وکارو کردەوەی چاک وخاوێنە و بەس. تەواوی ئەوانەش پێوەندی یان بە خودی فەردەوە هەیە و کاری بە رەگەز و رەنگی پێست وشتی دیکەوە نیە . هەر وەک لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە" **یاایها الناس انا خلقناکم من ذکروانثی وجعلناکمشعوبا "وقبائل لتعارفوا ان اکرمکمعندالله اتقیکم ."**

" ئەی جەماوەری خەڵک ئێمە ئێوەمان لە ژن و پیاو وەدی هێنا . نەتەوە وهۆزمان لە نێو ئێوەدا پێک هێنا .بۆ ئەوەی بناسرێن . بەراستی خۆشەویستترینی ئێوە لەلای خودا ئەو کەسەیە کە پارێزگارترە" .

یان لە جێگایەکی دیکە فەرموویەتی" **یا ایها الناس اتقوربکم الذی خلقکممن نفس واحده وخلق منها زوجها وبث منهما رجالا"کثیرا "وانساء "**

" ئەی جەماوەری خەڵک لە خودا بترسێن کە لە یەک نەفسی واحیدە ئێوەی دروستکرد وبۆئێوە هاوسەری دروست کرد، ولەنێو ئێوەدا پیاو و ژنی زۆری ئافەریدە کرد ."

ئیسلام دژی "تعصب"ی رەگەزپەرستانەیە . ئێستاش لەنێو ئەم کۆمەڵگایانەدا کەرێبازی "محەممەد"یان (ص) رەچاو نەکردووە وئایینی ئیسلامیان وەرنەگرتووە تاغووتی "تعصب"ی نەژادی لەنیو نەچووە . مەسەلەن هێشتا گیر و گرفتی رەش پێست وسوورپێست لەولاتە یەککرتووە

ـ کانی ئەمریکادا هەر بەردەوامە و هیچ چارەسەری نەکراوە ! هەروەها گیروگرفتی رەشەکان لە ئەفریقای جنووبیدا هیچ رێگا چارەی بۆ نەدۆزراوەتەوە. مەسەلەی ئاپارتاید لە زەمانی ئێمەدا لەسەر بنەمای رەگەز پەرستی و بەگەورەزانینی نەژادی ئاریا ێک هات کە زاراوی ئاڵی نەمان و نەگبەتی لە گەرووی ئینسان کرد و هەرئێستا سجوونەکەی ئیسرائیل

کە وەک درک لە کەلەکەی بەتەوەی عەرەب راچوون خۆیان لە نێو رەگەرەکانی دیکەی دنیادا بەهەڵبژاردە و سەروەر دەزانی .

بۆرینی ئیسلام لەگەل "تعصب"ی دینی خەباتی دەکرد . لە دنیای ئەو رۆژەدا کە ئیسلام سەری هەڵدا رایگەیاند "**لا اکراه فی الدین قد تبین الرشد من الغی "فمن یکفر بالطاغوت ویومن بالله وفقد استمسک بالعروة الوثقی .....**"

قەبووڵ کردنی ئایینێ مەیل وەراو بە زۆرەملێ نابێ نادرە . لە رێگەی هیدایەت و رێ نوێنی بەوە رێگەی راستی بۆ هەموو کەس روون دەبێتەوە . خەڵک لە ئاعووب رووگەردان دەبن وئیمان بە خودا دێنن وئەو پێوەندییە لەگەڵ پەروەردگار پێدا دەکەن کە قەبتا بیێ و خودای گەورە زۆر رانا و بینایە .

وەیا فەرموویەتی : "**ولو شاء ربک لامن فی الارض کلهم جمیعا " فانت تکره الناس حتی یکونوا مومنین .**" ئەگەر خودای تەعالا بیویستبایە ، هەموو ئەوانەی کە لەسەر زەوین ئیمانیان دەهێنا (ئێمە بەمانەویست ) بۆ خۆن دەتوانی بە زۆر وزۆرەملێ هەموان بکەیە خوا پەرست و مومن ؟

ئیسلام تاعووتی "تعصب"ی دینی تێکشکاندبا دنیا بەێتە جێگەی دەسەڵاتداری و فەرمانی ملووکانە . ئایین پشتیوان وپاڵپشتی ئازادی عیبادەت ونایشە بۆ موسوڵمانان و خاوەنی ئایینەکانی دیکەش لە نیشتیمانی ئیسلامماندا . ئیسلام بەو دەلیلەی کە لە خوارەوە دەی بێنین ئیجازەی شەڕ وکوشتاری داوە .

**ان الذین یقاتلون بانهم ظلموا وان الله علی نصرهم لقدیر . الذین اخرجوا من دیارهم بغیر حق الا ان یقولوا ربنا الله ولولا دفع الله الناس بعضهم ببعض لهدمت صوامع وبیع وصلـــوات و مساجد یذکر فیها اسم الله کثیرا "".**

ئەو مۆمنانەی کافران بەناحەق وبەناڕەوا لە ماڵ وولاتی خۆیان دەریان کردن(بێ ئەوەی گوناهێکیان هەبێ) تەنیا خەتایان ئەوە بوو کە دەیانگوت ئێمە خودای تاک و تەنیا دەپەرستین و ئەگەر خودای تەعالا ئیزنی خەبات وشەڕ بدا و زۆرەملێ و ستەمی هێندێکیان بەدەستی هێندێکیان وەلا نەبا بێگومان سەومیعە ودەیر وکەنیشت ومزگەوتەکان کە لەواندا زیکرو یادی خودا دەکرێ تێکرا وێران دەبن . مەبەست لە "صومعە" عیبادەتگای راهیبان و مەنزوور لە " بیع " کەنیشتی نەسارایە مەنزوور لە " الصلوات " عیبادەتگای جوولەکەکان و "مساجد"یش جێگەی نوێژ و عیبادەتی موسلمانان بووە ، قورئانی پیرۆز لەم ئایەتەدا عیبادەتگای جوولەکە و مەسیحی وەپێش مزگەوت دەدا . ئەوە نیشان دەدا کە ئیسلام دژایەتی لەگەڵ ئەم ئایینانەدا نییە و بۆ جێگەی عیبادەت و پارانەوەیان رێز دادەنێ .

رووحی بەخشین ولێبوردنی ئیسلام لەوەش بەرزترە چونکە ئیسلام لە موشریکانیش حیمایەت دەکا وئازاریان نادا . یانی ئەو کەسانەی کە ئایینی ئاسمانیان نییەوبێ هێزن وناتوانن خاوەن ئیمانەکان ئازار بدەن و تەنگ وچەڵەمە پێک بێنن لە پەنای ئیسلامدا بە ئاسوودەیی دەژین . ئەم دەستە عوزریان نەزانین و جەهلە و عوزرەکەشیان قەبووڵ کراوە .

"**ومن احد من المشرکین استجارک فاجره حتی یسمع کلام الله ثم ابلغه مامنه ذلک بانهم قوم لایعلمون** ".

ئەگەر کەسێک لە موشریکان پەنای بۆهێنای تا لە کاری ئایین ئاگادار بێتەوە پەنای بدە تا کەلامی خودا ببیسێ وپاش بیستنی کەلامی خودا بێ ترس وخۆف لە جێگایەکی ئەمین وئاسوودەی دابنێ چون ئەوانە نەزانن .

ئەدەب بە مانای گشتی و هەراوی خۆی، نیشانەی بوونی هەر گەل ونەتەوەیەکە ،چونکە ئەگەر گەلێک بێتە مەیدانی گەلان و ئیدیعای ئەوە بکا کە گەلێکی سەربەخۆیە پێش ئەوەی داوای قەوارەی سیاسی لێ بکەن ، داوای زمان و کۆلتوور و بەرهەمی فەرهەنگی لێدەکەن .

ئەگەر ئینگلیسی پێ دەڵێ : من خاوەنی شاکاری "ئۆتێللۆ"م عەرەب بێ خێرا دیوانێکی ئەحمەد شەوقی دەدا بەدەستەوە

هیچ لاف وگەزافێک ناکاتە ئەوەی بەخۆمان بڵێین گەل و نەتەوە ، کەچی خاوەنی ئەو کەسایەتی یە ئەدەبی یە نەبین ،کە بێتە شوناسنامەو بە جیهانمان بناسێنێ .

شاعیر ونووسەری فرەسەلگە نین لەسەر کەسایەتی ئەدەبی و سەربەخۆیی فەرهەنگی .ئەگەر بێتوو ئەدەبەکەمان بە شیعرو پەخشانیەوە رووبەکی جیاواز لە رووی ئەدەبی گەلانی تری نەبێ .

دوو پێکێنەری گرینگ لە قالبی نووسیندا هەیە ، کە دەتوانن رێخۆشکەری نیشاندانی ئەدەبی کوردی بن لە ئاستی جیهانیدا .

یەکەم : ژیاندنەوەی فۆلکلۆری کوردی .

دووەم : ناساندنی ئەدەبی کورد بەدەرەوە (وەرگێڕان) .

با نووسەری کورد ژیانی کوردەواری بناسێنێ . شیعری ئاوێنەی رووداوی سروشتی و مێژوویی وئەفسانەیی ناو کوردان بێ . مەرجیش نیە روخساری بەرهەمی کوردی تەنیا زمانی کوردی بێ . گرینگ دەرخستنی فۆلکلۆرو بیرو باوەڕو بۆچوونی کوردە لە قالبێکی ئەدەبی سەرنج راکێشدا .

چەند شیرینە "ناوی کوردی" وەکوو" جوامێر ،شاسوار ،حەمۆ" بچێتە ڕیزی ئەدەبی بێگانە ، ئەوەتا "زیۆس وفینۆس و .....! چەندان ناوی بیگانەی گەلانی تر بە بۆنەی دروست بوونی بزووتنەوەی تەرجەمەکاری یەوە هێمای ئەدەبی یۆنانین .

تەنانەت بەکارهێنانیشیان بەڵگەیە لەسەر کارلێکردنی ئەدەبی یۆنان .

نووسەرانی ئەفریقا ئەگەر چی بە زمانی ئورووپایی دەنووسن ،ئەوەیان لەیاد ناچێ فەرهەنگ وباری ژیانی گەلانی خۆیان بنووسن . بۆ نموونە وول سۆینکا نووسەری نیجێریا کە ئەمساڵ خەڵاتی " نۆبڵ"ی وەرگرت . ئەگەرچی ئەو بە زمانی خۆی نانووسێ بەڵام نووسینەکانی بوونەتە ئاوێنەی بیروباوەڕی گەلەکەی خۆی . تەنانەت زۆربەی رۆمانەکان باسی " خوای ئەفسانە"یی ئۆگۆن کە گوایە خوای شۆڕش و رابەرینە دەکا .

نووسەری کورد ئەرکێکی گەورەی لەسەرشانە ،بەتایبەتی ئەمرۆ لە هەموو رۆژێک زیاتر بانی ئولتیماتۆمێکیان

خستمۆتە بەر، بۆ ئەوەی بسەلمێنی خاوەنی ئەدەبێکی سەربەخۆیە . وەنەبێ دروست بوونی ئەدەبی سەربەخۆش هێند گران بێ کە .نووسەری کوردمان نەیتوانێ! بەڵکو بە پشتیوانی ئەو فەرهەنگەی لە دێرزەمانەوە ریشەی داکوتاوە دەتوانێ بەدی بێنێ . چونکە پەیوەندی یەکی بەتین هەیە لە نێوان ئەدەب و فەرهەنگدا ، هەتا وای لێهاتووە زۆرکەس ئەدەب بە فەرهەنگ وفەرهەنگ بە ئەدەب دەزانن.

فەرهەنگ ئەگەر بریتی بێ لە بۆچوونی ئیعتقادی گەل سەبارەت بەژیان ودیاردەکانی سروشت وچۆنەتی بەڕێوەچوونی ئەو کاتە پاڵپشتێکی بەتینی ئەدەبە .چونکە پەیامی ئەدەب بریتی یە لەبیروباوەڕ .

فەرهەنگ ئەگەر لە داب و هەڵس وکەوت وچۆنەتی بەڕێوە بردنی رەوڕەوەی ژیان پێک هاتبێ دیسان ئەدەب وەکوو زمانێکی گۆیای واقیع پێویستە پشتی پێ ببەستێ و بڵاوی بکاتەوە.

فەرهەنگ ئەگەر بریتی بێ لە مێژووی رابردووچۆنەتی پەند لێ وەرگرتنی ئەوساش هەر دەتوانێ ببێتە ناوەرۆک و بەڵگەی ئەدەب . بۆیە ئەدەبیات کراوە بەچەندبەش :

کلاسیک ، رۆمانسی .ریالیزم نوێ ، کۆن، ئەفسانەیی ، ئەدەبی بیرکردنەوە ،ئەدەبی رەوشت ، وچەندان لک وپۆپی تریش .بۆ نموونە ئەدەبی ماقووڵ ـ الادب المعقول .

بێینەوە سەر باسەکەی خۆمان :سوپاس بۆخوا گەلی کورد بیروباوەڕێکی تایبەتی و داب و(نەریتێک)ی تایبەتی ومێژوویەکی تایبەتیشی هەیە . ئەمانەش کافین بۆ دروست بوون ودەرکەوتنی ئەدەبێکی تایبەتی .

ئەگەرچی وەرگرتنی ئەدەب لە گەلێکی تر دەکەوێتە بەر ئەو پەیوەندی یە ئینسانی یەی لە سروشتی ئادەمیزادەوە هەڵدەقوڵێ . بەڵام ئەمە نابێتە بیانوو بۆکەمتەرخەمی لە بواری بنیادنانی ئەدەبی سەربەخۆدا .

بەوبەڕی داوای لێ بورد ـ نەوە دەڵێم :شاعیرانی کوردی وەکوو نالی ومەحوی و...هتد بەڵێ توانیان زمانەکەمان بپارێزن ، زاراوەکانی پەرە پێ بدەن ا بەڵام ...بەداخەوە نەیانتوانیوە بنیادنەری ئەدەبێکی سەربەخۆ بن. چونکە شیعرەکانیان مەگەر(بەدەگمەن) سەراپا وەرگرتنە لە ئەدەبی فارسی وعەرەبی وبەکارهێنانی شێوازی ئەوان لە دەربڕینی مەبەستدا .

کەچی کەسێکی گەورەی وەکوو خانی بەو (مەموزین)ەی توانی بۆ چوون ومێژوویەکی (ئەفسووناوی یا راست ) بهێڵێتەوە ،بەجۆرێک بوون و مانی مێژوو بناسێنێ .

ئەمەسەرەڕای ژیاندنەوەی داب ونەریت و حل و بەرگی میللی کوردە .ئەوەتا ئەگەر یەکێک شاکارەکەی خانی بخوێنێتەوە بۆی دەردەکەوێ بارودۆخی کۆمەڵایەتی وفیکری و فەرهەنگی وکۆڵتووری ئەو کۆمەڵەچۆن بووە ؟

بەم بۆنەوە جێی خۆیەتی داواکاری یەک بکەم لەزانایان ونووسەران و بێژانی گەلی کورد .هەرچی پتر هەوڵی نیشاندانی کەسایەتی یەکەی بتەوی ئەدەبی کورد بدەن .من نالێم ئێمە ئەدەبەکەمان ناتەواوە ، پەنابەخوا .بەڵام ئەوەندە دەڵێم نەناسراوین لاساکردنەوەمان زۆرە ، بەلە دەکەین، کتێبخانەکەمان هەژارە . یا دەوڵەمەند بین بمانناسن . بۆچی گلەمان لێ بکەن . باپێش هەموو کەس خۆمان گلەیی لەخۆمان بکەین.

ئەم هەموو نووسراو و بەیتەمان هەیە تائێستا بێجگە لە : "زانی گەل" کە کراوە بە فارسی و"مەموزین" کە کراوە بە عەرەبی و بێجگە لە چەند بەرهەمی تر . هیچمان نەگەیاندووە بە جیهانی رووناکی ئەدەبی جیهانی .

# لیرەدز

م. ر. تەوەکولی

بەبۆنەی ناونانی کوڕێکی تازە لەدایک بوو لە ماڵی میرزا سەلیمی کووتاڵفرۆش ئاهەنگێکی شادی ڕێکخرابوو. جەماوەرێکی زۆر لە ئاشناو ڕۆشنا ودەروجیران و خزم و قەومان بۆ بەشداری لەم ئاهەنگەدا بانگ کرابوون. میرزا سەلیم و پەریزادخانمی خێزانی وەک ئاشی باهەڵدە ـ خولان وسەریان قاڵ بوو. هەموو دەروژووری ماڵەکەیان چراخان کرابوو. کارەکەرو نۆکەریش بێ وچان خەریکی ئاوپرژێن و خاوێن کردنەوەی بەر دەرکا و حەوش وبان بوون.

دوای بانگی شێوان میوان یەکە یەکە ودوان دوان پەیدا بوون. کۆک و پۆشتە و بۆشناغ بە جلکی پلاوخواردنەوە وەژوور دەکەوتن و لە لایەن میرزا سەلیم و پەریزادخانمەوە پێشوازیان لێدەکرا وبەگەرمی بەخێرهاتن دەکران و هەرکام بەپێی تەمەن و ناو و ناوبانگیانەوە لە شوێنی تایبەت دادەنیشتن وپیرۆزبایی لەدایک بوونی منداڵە ساواکەیان بە باوک ودایکی دەگوت.

پەریزادخانم خشڵ و زێڕو زیوێکی زۆری بەخۆیدا کردبوو دەتگوت تاورسە چەتری ئەنگاوتووە و خرینگ و هۆڕی بازنە وزرەی گۆ بەرۆک و زرینگەی لیرەی ملوانکەی گوێی ژن و پیاوی دەلاواندەوە.

یەکێک لەمیوانەکان حەمەی شەربەت فرۆش بوو کە لە لای خوارەوە بێدەنگ و کش ومات دانیشتبوو وکەوتبووە دەریای خەیاڵەوە، دیار بوو لەوبەزم ورەزمەشدا هەژاری ونەتەواوی دەستی لێ هەڵنەگرتووە و لە ناو شەپۆلی بەتەوژمی خۆیدا سەروبنی پێدەکا و گێژوخولی پێدەدا. جار جار تەقەی فینجان وقاقای پێکەنینی میوانان دای دەچڵەکاند. وەک کەسێکی لە خەو ڕاپەڕێ لە نەکاو سەری هەڵدەبڕی و سەرنجێکی ئەم لاو ئەولای خۆی دەدا و دیسان دەسرەوتەوە سەری دەبردەوە بەرخۆی ولە دەریای بێ بنی خەیاڵدا نوقم دەبوو.

پاش دوو سەعاتێک سفرە ڕاخرا وبەهەموو جەشنە چێشت وخواردەمەنی و میوەیەکەوە ڕازایەوە. میرزا سەلیم و پەریزادخانم ڕوویان کردە میوانەکان وبەڕێزەوە گوتیان "فەرموون. نانی خەجاڵەتیشە دەبێ بە گەورەیی خۆتان لێمان ببورن!"

میوانی بە کەیف ودڵخۆش بە ئیشتیا هرووژمیان کردە سەر سفرە و بە پارووی زل وقەڵەو کەوتنە گیانی ئەو هەموو تەعامە خۆشەی کە ئامادە کرابوو. بەڵام حەمەی شەربەت فرۆش زۆر بەشێنەیی دەستی بە خواردن کرد ولەپێش هەموا ـ نیشدا دەستی هەڵگرت ولەگەڵ خواردنیشدا هەر چاوی لەملاو ئەولای خۆی دەکرد:

ئاخۆ کەس ئاگای لێیە چی دەخوا و چی دەکا؟!

پاش نان خواردن کوڕی مەلۆتکە کراویان بردە بەر دەمی مەلاکەریمی پێش نوێژی مزگەوتی گەڕەک تاناوی بنێ. مامۆستاش دوای بانگ بەگوێ دادان وخوێندنی چەند ئایەتێک لە قورئانی پیرۆز ناوی نا "ناسر" و نەختێکی وردەقەند دە دەمی کردو بۆ تەمەن درێژی و ئاخر خێری مەلۆتکە کەوتە پاڕانەوەو و پاش ماوەیەک دایەوە دەست میرزا سەلیم

شەو درەنگ بوو میوان هەستان بڕۆن. پەریزاد خانم لەو کاتەدا دەستی بۆگەردنی خۆی درێژ کرد وهەستی کرد کە یەکێک لە لیرەکان کەوتووە.

ژن بێ وزنری لێ ون بێ و زیرەی لێ بلێند نەبێ ! خۆی بۆ رانەگیرا و هەرای لێ بلێند بوو !

" ئەیەرۆ خۆ دانەیەک لە لیرەکانی ملوانکەکەم دیار نیە ! "

دەستی کرد بە پشکنینی ولات وئەم سەرەو سەرو ئەملاو لان کرد . بەلام نەی دۆزیەوە . شکی پەریبۆ سەر میوانەکان بەلام لە رووی هەڵنەدەهات بپرسێ داخۆ دیویانە یان نا ! یەکێک لە میوانەکان کە هەستی بە شک وگومانی پەریزاد خانم کردبوو گوتی :

"ئەوەی پێناوێ دز یەکێکە وشک هەزارە !تۆ ژنەکان بپشکنەوکاک میرزاش پیاوەکان ژن و مێرد لە ولامدا گوتیان:

" ئاخر چۆن دەبێ بتان پشکنین . بەخودا مەگەر لەمەودوا تەماشای ناوچاوا ـ نتان نەکەین ! ؟

لە دڵیشدا حەزیان بە پشکنین دەکرد . بەلام لە هەوەڵەوە خۆیان راگرت و دەنگیان نەکرد . لە ئەنجامدا لەسەر ویستی هێندێک لە میوانەکان دەستیان بەپشکنین کرد .هیچیان بە کەسەوە نەنی. تەنیا حەمەی شەربەتفرۆش ما بوو بپشکندرێ. ئەویش هەر خۆی وەدوا دەخست بەڵکوو لەبیریان بچێتەوە و نەی پشکنن ! ئاخری میرزا سەلیم گەیشتە بەردەمی و گوتی :

"کاکەحەمەدبەشەرمەزاری بەوە! با تۆش بگەرێم ."

بەلام حەمەی شەربەتفرۆش نەیهێشت بیپشکنن !

ئەم خۆ بەدەستەوەنەدانە خانەخوێ ومیوانەکانی دڵنیا کرد کە لیرەکە حەمەی شەربەتفرۆش هەڵیگرتووە . میرزا سەلیم لەرووی هەڵنەهات حەمەی هەڵپێچێ ولیرەی لێ بستێنێتەوەلەرووی ناچاری گوتی :

" باشە کاکە حەمە .قەیدی نیە ! بەلام حەقی ئەو کارەت نەبوو! "

حەمەی شەربەتفرۆش ئارەقێکی ساردی دەرداوسەری داخست . میوان بەچاوی سووکەوە دەیانروانیە حەمەو ورتەیەکیان لێدەهات و خودا حافیزیان دەکرد و دەرۆیشتن حەمەش بەدوای هەمواندا بە پێدزە ماڵی میرزا سەلیمی بەجێ هێشت .

لە دوای ئەم رووداوە لە گەرەکی ماڵی میرزا سەلیمدا بووبە قاو کەحەمەی شەربە ـ تفرۆش نمەک بەحەرامی کردووە ولیرەی پەریزادخانمی دزیوە . بەلام میرزا سەلیم ئەوەندە پیاوێکی لێ بوردووە کەهیچی بە حەمە نەگوتووەولێی خۆش بووە .

مانگێک بەسەر ئەو رووداوەدا تێ پەریبووڕۆژێک پەریزادخانم خەریکی پێچانەوەی یەکێک لە قالی یەکانی دیوەخان بوو تا بدا بۆی بتەکێنن . کەچی تەماشای کرد لیرەکەی لەژێر فەرشەکەدایە ! لە خۆشیان وەخت بوو شاگەشکە بێ ! دەس بەجێ خۆی گەیاندە دووکان و مزگێنی بە مێردەکەی دا .

ئەویش لەخۆشیان وەک گوڵ گەشاوە وبۆیان دەرکەوت حەمەی شەربەتفرۆش دزی لێ نەکردوون .

بەپەلە چوون حەمەیان لە ناو بازار دۆزیەوەکە لەبەر دوکانێکدا شەربەتی دەفرۆشت ژن ومێرد بە شەرمەزاریو خەجلاوی یەوە چوونە پێش و گوتیان :

" کاکەحەمە ببوورە! پێمان وایە لەو شەوەی ناونانی ناسرەوە دڵت لێمان ئێشابێ . حەقیشتە . بەراستی شەرمەزارین بەلام شتێکت لێدەپرسین راستمان پێ بڵێ. بۆچی زیاد لەو هەمووو میوانە تۆ نەت هێشت بت پشکنین ؟ گوتی وەڵلا ئەوەی راست بێ ئەوشەوەی میوانتان بووملەماڵی خۆمان هیچمان نەبوو منداڵەکان بیخۆن. منیش بە هەلم زانی لە بەشە چێشتی خۆم نەختێکم خوارد وئەوی ترملەبا بۆڵەیەک کرد وخستمە گیرفانمەوە تا بیبەمەوە بۆمنداڵان کەبێ شێو سەرنەنێنەوە ! بۆیە نەمهێشت بمپشکنی کە ئەو رازەم لێ ئاشکرا نەبێ !

# تەنیای تەنیا ؟

ڕەخنەگرتن ولێکۆڵینەوە لە چیرۆک و شێوەی نووسینی چیرۆک کارێکی گەورە وبەنرخە. بۆ هاندانی چیرۆک نووس لە گەیشتن بە ئامانجی بنەڕەتی ئەدەبیات واتە هاندانی مرۆڤ بۆ هەراش بوون وگەیشتن بە پلەی بەرزی مرۆڤایەتی .. لەو بابەتەوە ئەرکی سەرشانی هەموو مامۆستا و زانایانی دڵسوزە کە چیرۆکەکان زۆر بە وردی شی بکەنەوە. و ئەو مەبەستانەی جوان و لەبارن هەڵیان بژێرن و ئەوانەی جوانی چیرۆکەکە دزێو دەکەن هەڵپەرتێون ، تالەم بارەشەوە چیرۆک نووسە لاوەکان جێ پێی خۆیان بناسن و وەرێ بکەون .

لێرەدا پێویستە بڵێم ئەوە نەکاری منی کەم مایەیە ونە راوگەی منی بۆرەسوار . جا کەوابوو لەتەواوی مامۆستایان داوای لێ بوردن دەکەم وئەگەر ئەو چەند رەخنەم لەچیرۆکی "تەنیای تەنیا" گرتووە ، تەنیای تەنیا مەبەستم رێ کردنەوە سەبارەت بە رەخنەی ئەدەبی یە وهیچی دی.ئەلبەت لەبیر نەچێ کە ئەگەر تەنیا ئەو چیرۆکەم هەڵبژاردووە نابێتە بەڵگە بۆ ئەوە کە دان بە باشی چیرۆکەکانی دیکە دابنێین بەڵکوو بە هۆی مەودای کەم وکاتی بەرتەنگ نەمتوانی چیرۆکەکانی دیکەی سروەی ژمارە ٦ بخەمە بەرباس.

بەدوای خوێندنەوەی مەبەستی "چ بنووسین" لەکاک هاوار لە گۆواری سروەوکتێبی شاری وێرانەبەش بەحاڵی خۆم چاوەروانییەکی پترم لەو نووسەرە بوو بۆچیرۆک نووسین. چونکوو هەر نووسەرێک پێویستە بەر لە نووسین مەبەست وپەیامێک رابگەیەنێ. بە کورتی دەبێ بەنووسینەکەی خۆی شوێن بخاتە سەر هەستی خوێنەر، ئاڵ و گۆڕێک لەودا بەدی بێنێ بە چەشنێک کە خوێنەر دوای خوێندنەوەی نووسراوەکە هەنگاو بەرەو پێشکەوتن هەڵێنێتەوە. بەڵام بەداخەوە چیرۆکی (تەنیای تەنیا ) لەو بابەتەوە کز و بەرتەسک بوو . تەواوی چیرۆکەکە لە سێ رستەی خوارەوەدا دەگونجێ :

**سۆران کوڕی پیاوێکی مەرداری بە ناوبانگە لەگەڵ هیوا زانستگا تەواو دەکەن وسۆران داوا لە هیوا دەکا چەند رۆژ لە گوندی ئەوان رایبوێرن. لەوێ هیوا دەزانێ سۆران دڵی داوە بە بەهارەی کچی خاڵی. بەهارە بەنابەدڵی بەشوو دەدەن ئەویش شێت دەبێ ولە ئاکامدا دەمرێ . سۆران دەساڵ رادەوەستێ ولە دواییدا سەکتە دەکا .**

من وام دەست کەوت کەئەو چیرۆکە بەر لەوە کەچیرۆکێکی کوردی رەسەن بێ و هێندێک لە قۆناغ وبابەتەکانی فۆلکلۆری کوردی بگرێتە بەر. دیتنی فیلمی رۆژئاوا شوێنی لەسەر داناوە وهانی داوە بۆ نووسینی ئەو چیرۆکە. روون و ئاشکرایە کە سۆران قارەمانی چیرۆک ناتوانێ کوڕی دەرەبەگێکی کورد بێ بەڵکوو زۆرتر شێوەی (مسترجان)ی ئینگلیزی دەدا بە خۆی و گیتارەکەیەوە کە لە هەر شوێنێک چ زانستگا بێ، چ نێو شار وشەقام دەنگ هەڵدێنی و دەخوێنێ وفڕیشی بە دنیاوە نیە . من کە پێم وانیە ئیمرۆ لەنێو کوردەواریدا هیچ کەس بێ ترس لە لۆمەی خەڵک ئیزنی ئەوکارەی بەخۆی دابێ. واجوانترە کە بڵێین ئەم

**چیرۆکە زۆرتر لاساکردنەوەیەکی دەست وپێ سپیلکانە بوولە چیرۆک وفیلمەکانی رۆژئاوا .**

بەلام چەند مەبەستم بۆ هاتۆتە پێش کە نووسەر نە باسی کردوون ونە رووونی کردوونەوە .

یەکەم :

سۆران کوڕی پیاوێکی مەرداری بەناوبانگە کەدەست وپێوەندیشیان زۆرە ،دڵ دەداتە بەهارەی کچی خاڵی و خاڵی لەپڕ بەهارە بەنابەدڵی دەدا بە پیاوێکی دزێوی ناشیرینی بەد ئەتواری پیر. بەهارە لە سەری دەدا و شێت دەبێ ودوایە سۆران ئەسرینی بۆ دەرێژێ . مەبەست لێرەدایە ئاخۆ سۆران داوای بەهارەی کردبوو ؟ پیرۆت ئاغای بابی بەهارە، بۆچی کچەکەی نادا بە سۆران کە هەم زانستگای تەواو کردووە وهەم خاوەنی ماڵ و سامانێکی زۆریشە .( لەبیرمان نەچێ لەو سەردەمەدا ئەگەر کەسێک زانستگای تەواو، کردبا، رێز و حورمەتێکی زۆری لە لای هەمووکەس بوو ) ئەسلەن هۆی دژایەتی خاڵی سۆران لەگەڵ ئەو چ بوو ؟

دووەم :

ئەو سەردەمەی کارەساتەکە رووی داوە زۆر داب و رەسمی تایبەتی لەنێو کوردان بووە (ئەگەرچی هەڵەش بووبێ) کە سۆران دەیتوانی بۆ بەرگری لە ئاکاری خاڵی رەچاویان بکا بەلام سۆران هەروا بێدەنگ دەبێ. نەکا سۆران بە درۆ بەهارەی خۆش دەویست ؟ سۆران ئەو دەساڵە چاوەروانی چ بوو؟ مەگەر بەهارەی خۆشەویستی نەمردبوو ؟ بڵێی ئەودەساڵە هەر چاوەڕێی هیوا بووبێ ؟

من دەڵێم سۆران ئەو ویستەی نەبووە بەڵکوو ئەوە ویستی نووسەرە کە سۆرانی چارەرەش ماوەی دەساڵ بەسەر شێواوی وردێنی بۆز و سەری ئاڵۆز وچاوی بێ سوێ و جل و بەرگی ژاکاو رادەگرێ کە هاورێی خۆشەویستی "هیواگیان لەدەرەوەی ولات بگەرێتەوە و شەو لە پەنای دانیشێ تا قامێکی بۆ بڵێ وسەکتە بکا ؟

ئاخر بۆکەس بەمن ناڵێ چۆن دەبێ پیاوێکی سەرو روو خۆش ، دەنگ پیاوو رەنگ پیاو پڕ لەزەوق وپڕیش لە هیوا ، سەررێژ لەهەستی ناسک وجوان زاناوزانستگادیو ، وەها گیرۆدەی ئەوینی کیژێک بێ کە هەموو ژیانی ببێتە شانۆی پڕ یەژارە و کەسەر !

بەراستی نووسەر لە چی دەگەڕێ ؟ دەیەوێ بڵێ چی ؟ بۆپێمان ناڵێ هیوا کێ بوو؟ لەو چیرۆکەدا چ دەورێکی دەگێرا ؟ دەساڵ لە دەرەوەی ولات کام عیلمی دەخوێنی ؟ کە دێتەوە سۆران بەسەرهاتەکەی بۆ دەگێرێتەوە و لە پەنای سەکتە دەکا ، بۆ نەئامۆژگاری دەکا ونە رێی پێشان دەدا ؟نە بیرورای خۆیسەبارەت بەژیانی سۆران دەردەبڕێ ؟ ئاخر هیوا چ جۆرە ئینسانێکە ؟

بەلام ئەویش تاوانبار نیە بەڵکوو نووسەرەکە پێی دەڵێ دەبێ بینەرێکی کش و مات بێ هەروەک ئێمەی خوێنەر .

من بەم براینە پێشنیار دەکەم ئەوجار کە ویستی بنووسێ لەبەرچاوی بێ کە نووسەر بەهۆی نووسینەکەی دەیەوێ هەر چەشنە ناکۆکییەک کە لە رەوشت و ئاکاری خەڵک دایە وهەروەها ئەوبیرو باوەڕانەی کە بوونە بەرگری پێشکەوتنی کۆمەڵ دەست نیشان بکا ورێی زاڵ بوون بەسەرئەم گیروگرفتانە بە خوێنەر نیشان بدا . جابۆیە ئەرکی سەرشانی نووسەر ئەرکێکی زۆر گەورە وگرینگە . هەڵەی نووسەر کۆمەڵێک بەهەڵە دەبا.پێویستە زانایانە و وشیارانە رێنوێنی بکا .

هەروەها نووسەر دەبێ قارەمانەکانی خۆی باش بناسێ ودژایەتی لە کردەوەیاندا بەدی نەهێنێ. دەبێ بزانێ کە جیاوازی نێوان ئادەمیزادو گیانلەبەرانی دیکە ئەوەیە ئینسان گیاندارێکی بێ هێز و بێ دەسەلاتنیە و بە هێزی عەقڵ و بیر، ئاڵ وگۆڕ لە ژیانی خۆیدا بەدی بێنی. لە جیهانی ئیمرۆی ئێمەدائینسان توانای بەربەرەکانی لەگەڵ

بروانە لاپەرەی ۳۶

ک.تەوەحودی

# شێخ ئەحمەد

«زانایانی بەناوبانگی کورد»

لە
رۆژئاوای شاری بازگیران لە نیزیک سنووری ئێران وورووسیا قەڵایەک (گوندێک) بە ناوی "بەر دەر" هەیە .مەودای ئەم گوندە تا بازگیران دوو فەرسەنگ وتاقووچان پازدە فەرسەنگە .

مەلا ئەحمەد خەڵکی ئەم گوندە بوو . پیاوێکی زانا و خەت خۆشێکی بێ وێنە بوو . ئەویندار ی فەرهەنگ وئەدەبی کرمانجی خۆراسان بوو و زۆریشی تێدا شارەزا بوو . هەمیشە جل وبەرگی کوردی دەبەر دەکرد وهەر وەک هەموو پیرەمێردانی وڵات پەستەکی لەشان دەکرد .ئەمخوالێخۆشبووە لەساڵی ١٢٣٩ هەتاویدا لە دایک بوو ولەساڵی ١٣٤٤ پاش ١٠٥ ساڵ ژیان ، دنیای بێ وەفای بەجێ هێشت .

مەلا ئەحمەد کاری کشت و کاڵ وئاژەڵداری دەکرد وبە دەست ومستی خۆی بەرێ دەچوو . قورئانی تەواو لەبەر بوو و لەناوچەی خۆراساندا کەمکەس لە تەفسیرو لێکدانەوەیدا شانی لە شانی ئەو پیرە بڵیمەتە دەدا . شیعرەکانی مەولانای رۆمی لەبەر بوو وبە دەنگێکی خۆش بە ئاهەنگ دەیگوتن . مەلائەحمەد یەکێکە لە تێکۆشەرەکانی رێگای ئیسلام وچەند قورئانی بە خەتی خۆش نوسیوەتەوە و لە ناوچەی سەرسنووردا بڵاوی کردۆتەوە . ئەم قورئانانە پیرۆزانە ئێستاش بەدەست خەڵکەوە ماون ویادگارێکی بێ وێنەن .

مەلا ئەحمەد لە سیغار و تریاک کێشان کە زۆر کەس مفتەلای بوون بە درێژی تەمەن خۆی پاراست . وتا رۆژی مردن لەشێکی ساغ و پتەوی بوو ودەستی لە کار و تێکۆشان نەکێشاوە .مەلا کوری کێوپارە بوو . لەگەڵ کەژ و چیای ئەستەم راهاتبوو .زۆری کتێب دەخوێندەوە و زۆریشی دەنووسی . لە هونەردا زۆر شارەزا بوو . بەتایبەتی لە خۆشخەتیدا کەس دەسکەنەی لە دوو نەدەکرد . لە ژێرەوە نموونەی خەتی ئەو هونەرمە- ندە دەبینن :

هەواڵدەری گۆواری "اطلاعات هفتگی" لە ساڵی ٤٣دا وتەو وێژێکی لەگەڵ ئەوپیرە دڵ روونە کردووە کە ئێمەش لێرەدا بێ دەست تێوەردان پێشکەشی خوێنەرانی بەرێزی دەکەین .

" بیستبووم لەوبەری چیا بڵێند وسەرکێشەکانی شیمالی خۆراساندا گوندێک هەیە کەپیرەپیاوێکی رووناکدڵ و هونەرمەندی تێدا دەژی. ئەو پیرە پاکە سەدوپێنج ساڵی لەتەمەنی تێ پەریوە وخەت خۆشێکی زۆر بەناوبانگە . دیسان پێ یان گوتبووم کە پیرەمێرد خاوەنی ئەزموون و بەسەرهاتی سەیرو سەمەرەیە وزۆر زانایە و زەینی زۆر بەقەوەتە ....

دلم بۆزیارەتی دەیکورکاند دووری وئەستەمبوونی رێگەم لەبیر بردەوە وبەرەو گوندی "بەردەر" کەنەوەد کیلۆمیتر لە قووچان واوەترە کەوتمە رێ. کاتێک گەیشتمە گوندەکە تووشی لاوێکی سوار بووم و داوام لێکرد ماڵی " شێخ ئەحمەدی ئەولیائی"م پێ نیشان دا .

بە چەند کۆڵاندا تێ پەڕین وگەیشتینە ماڵی شێخ . لەپەنا دیوارێک

آل عمران ١٠٤

ربنا وآتنا ما وعدتنا على رسلك ولا تخزنا يوم
القيمة انك لا تخلف الميعاد فاستجاب لهم
ربهم انى لا اضيع عمل عامل منكم من ذكر او انثى بعضكم
من بعض فالذين هاجروا واخرجوا من ديارهم
واوذوا في سبيلي وقاتلوا وقتلوا لاكفرن عنهم سيئاتهم
ولادخلنهم جنات تجري من تحتها الانهار ثوابا من
عند الله والله عنده حسن الثواب لا يغرنك
تقلب الذين كفروا في البلاد متاع قليل ثم مأويهم
جهنم وبئس المهاد لكن الذين اتقوا ربهم
لهم جنات تجري من تحتها الانهار خالدين فيها
نزلا من عند الله وما عند الله خير للابرار

پیاوێکی ڕەزاسووک و بەسەرو سیما کە تێوچاوانی نووری لێدەباری دانیشتبوو. زۆر زوو لێم حاڵی بوو کە ئەوزاتەی بەرامبەری راوەستاوم خوێەتی ....

بۆماوەی چەندسەعاتان لە خزمەتی بووم. لە هەموو بارێکەوە دەدواین. شێخ لە منالییەوە دەستی کردبوو بە خوێندن وپێش هەموو شتێک سەرف ونەحوی عەرەبی خوێند. پاش چەند ساڵ خوێندن و لێکۆڵینەوە ئەوجار دەستی کرد بەدەرس دانەوە وسەتان کەس لەژێردەستی‌دا پێگەیشتن.

ئەم زاتە گەورەبە سەتان

کتێبی بەنرخی خوێندوتەوە و ئاگاداری یەکی بەرینی وەدەست خستووە. بەتایبەتی شارەزایی وناسیاوی یەکی زۆری لە وڵاتانی دەرەوە هەیە وئێستاش هەموو رۆژێ کتێبێک دەخوێنێتەوە ....

شێخ ئەحمەد گفت ولفتی زۆر خۆشە وبێجگە لەوەی عەرەبی باش دەزانێ زۆریش جوان دەنووسێ و خەتی زۆر خۆشە وتا ئێستا چەند جلدی قورئان بەخەتی خۆی نووسیوەتەوە. لەشێخ ئەحمەدم پرسی زۆر حەز لەچی دەکەی گوتی: "بەدیتنی خەتی خۆش هیچ غەمێکم نامێنێ" ئەوجار لێم پرسی ئەدی بەچی زۆرنا رەحەت دەبی؟ فەرمووی "کاتێک دەبینم و دەبیسم **کوڕو** کاڵ سیغار دەکێشن و ئارەق دەخۆنەوە وەک مێوژۆکە دەلەرزم."

# ئازیزە

دلّم دێشی سەرم هەلّ نا یە
لەبەر با رستی دە غەما ن
ئەوەلّ با نگم وەبەر بینا یی چا وا ن
ئەوی دیم وەبەر رەسولّ ئەلّلاّ یە
وەرە عا زیزێ
با نگی دیم وەبەر حەزرەتی مووسا یە
هەزا رویەک کەلیمەی عەرزی بینا یی چـــا وان
دەکرد
لەسەر کێوی تووریّ

کەلیمەی دە (لاا لەا لا ا للە )یە
وەرە عا زیزێ
با نگی دیم وەبەر عیسا ی رووح ولّلاّیە
وەبەر حەزرەتی دا ودی
ئەگەر سا حەبی تەوڕا ت وزەبوورو ئینجیل بوون
لەسەر ئەویّ دنیا یە
وەرە عا زیزێ
با نگی دیم وەبەر حەزرەتی سولەیما نی
حوکمی دەکرد لەتەیرێ ،لەتووریّ ، لەبا لّداری

نابێ شەبەقی ڕوژێ بدا لەخاتبلقیسایە ،
وەرە عازیزێ
بانگی دیم وەبەر ئەسکەندەری چوارقورنە
خەرجی دەستاند لەمانگ وڕۆژێ ،لە دەریایە
وەبەر حەزرەتی یۆسپی
کەجوانی وی مەنشوور بوو
لەسەر ئەوێ کاولە دنیایە
وەرە عازیزێ
وەبەر حەزرەتی خالیدی
هەزارویەک لفکەی بەردەداوە
لە ڕۆژی دە دەعوایە
وەرە عازیزێ
بانگی دیم وەبەر ئیمامی عومەری
دەیکرد ،فەتحێ ،دەگەل ئەوێ خەزایە
وەبەر ئیمامی عەلی
ئەگەر بە ڕۆژی جومعان
سواری دولّ دولّی دەبوو
بە عەزمی دەخەزایە
وەرە عازیزێ
بانگی دیم وەبەر ئیمام مووسای کازم
وەبەر شێخ مارفی کەرخی ،
وەبەر شێخ بەهلوولی دانا
ئەگەر سواری قامیشی دەبوون
بەرۆژی جومعەی ،هەموو نوێژانیان
دەبردەوە کابەتولّلایە
وەرە عازیزێ
بانگی دیم وەبەر شەمسی تەورێزی
وەبەر گومبەزی سەهەند بابای
ئەگەر هەموو سبەینان
لێی دەداوە گزینگی دەتاوێ
وەرە عازیزێ
سەرم دێشێ ،دلّم راناوەستێ
لەبەر ئەوێ ژانێ
ئەوەلّ بانگم وەبەر بینایی جاوان
ئەوی دبکەم وەبەر پێغەمبەری ئاخری زەمانێ
وەرە عازیزێ

بانگی دیم وەبەر پیرناسری
ئەوی دیم وەبەر گومبەزی جاشێرانێ
وەرە عازیزێ
بانگی دیم وەبەر چاکەگولەی بابخالانێ
وەبەر شێخ رەش وشێخ مەندان
ئەگەر تیرەنداز بوون لەسەر ئەوێ کاولـــــە
دنیایە
وەرە عازیزێ
بانگی دیم وەبەر چل سەیدی ،سۆفیانێ
وەبەر سولّتان بەیاقووبی گوندی خەلیفانێ

وەرە عازیزێ
بانگی دیم وەبەر چاکی قەرەقاجاتی عەجە ـ
مستانێ
وەبەر پیر مەرغەولی
وەبەر گومبەزی سولّتان سەید وەقازی
گومبەزی مەبارەکی دەرِوانێیە
شەرەفکەند ولووساوکانێ
وەرە عازیزێ
خۆ من دەست هەلّناگرم
لە خانەدانی دەساداتان
هەتا ئەو رۆژەی پێغەمبەری ئاخری زەمانێ
لە سەحرای مەحشەرێ ،
خێروشەڕ بەش نەکرێ ،نەگرێ قەرارێ
دەگەلّ ئەوێ دیوانێ

# شەو
## لەچوار فەسڵی ساڵدا

بەهارە شەوە، زەوی دەسماڵی پوولەکە ڕێزی ئەستێرەی لێ شانەوشان کردووە بەرۆکی تمرازاوی شوێنی حەسانەوەی زیندەوەرانە.

شەوە، کوچکاوری حەوشەی لاپەڕان بووژاونەتەوە، لەگەڵ نارە ناری شوان گرِ کەوتۆتە سەماوچە مۆڵە لەتاریکی دەنێ.

شەوە، جێژنی بۆقانە، بەزمە، هەڵڵایە، هەرایە کەس خەتی کەس ناخوێنێتەوە هەرکەس بەڕبەی خۆی دەپێوێ.

شەوە، ئاوێک دمێ بە کوڵمی گوڵەوە ناوە وهەر تاوە ناتاوێکیش دەخزێ و دەستی دەباتە ژێر کراسی تەنک وناسک وقانەقدیلەیدەدا.

شەوە، بولبول لەسەرچلان دڵی دەدا چلان، تەنانەت. وەنەوز چەشنی خەیاڵ بەچاوی دارانابرێ، بێ ئۆ قرەیە جارجار ورتەیەکی لێوە دێ وادیارە شتێک دەڵێ، یاخۆ بیر دەکاتەوە بیرلەسبەی سبەینێکی ڕووناک، سبەینێکی تاریک.

شەوە، شنەبا بەپەناسیلە- ی جێ ژواندا دەخوشێ، لەگەڵ هەناسەی لاوزولفی شانەکراو دەشەمزێنێ ولە بن هەرتاڵەمووەکدا خۆدەمرێنێ.

هاوینە شەوە، ڕەنگدانەوە و دەنگدانەوەی هەستیپەستی ناخی کۆندێک شەمشەمە کوێرەی خستۆتە ورینگە.

شەوە، سیسرک لە ژووری تاریک وقورماویدا دەستی کردووە بەگۆرانی ویەک بین ویەک هەوانایمالێتەوە، دەبێ بەچی وبەکێ هەڵبلێ؟

شەوەکەوەکەی سروشتە نەک کەوی شووڵی بێگیان کەفیزاوە، چەمیوە، تەنیوە بۆتە زیندان.

شەوە. کانی چۆلە بەلام شەپۆل ناسرەوێ بۆن وبەرامە- ی جێ ماوی گەورەکچان ئەوینی ژینی ساکاردەگەشێنێتەوە.

شەوە، پاڵەی ماندوونوستو- ون لەپی دەستیان پێدەشتێکی چۆل ورەقەنە کە پیت وبەرەکەت و بەرهەمی لێڕەخساوە.

شەوە، چەق ولووری سەگەل لەپەناخاوەن ماڵی بێ خەبەر وریا وگوێ قولاغ دەکەنەوەوهەستی پێڕادەگرن کوڕ گەلی دڵتەڕی گەڕاوە لەگەڕ دەخەن وبەپەسارانیان

هەڵدەبەسترێن.

پاییزە شەوە، ئاریزی رسر خەریکی کۆچ کردنە ،بەگەردو تۆزەوەسورەی ئاوابوون دەکا.

شەوە، گەردە لوول پڕوبووی:وکەماکۆن وفانگەلاشک، تێکەوە دەبێچێ ورەپێچەکی دەداوبەرە وحرودۆڵ وکەندالا-نیان دەفرێنێ.

شەوەپەنجەی شەپۆل هەزاران لوتکەی ژیان نەرم نەرم دەبزێوێ چەشنی بێشکەی منال بۆ خافلاندن وژیر کردنەوە ولە خەوکردن رایاندەژێنێ.

شەوەهەر خەیاڵەگەرۆڵی گەریدەی بێ دەنگ ورەنگ، داناکەوێ ،لاناکەوێ، هەتا هەزاران خەیاڵ نەگرێتەئامێز

شەوە ،تەشی زەمان بە باری ئاوە ژوودا دەخولێ وریسی ژیان خەریکە خاو دەبێتەوە.

شەوە، تەگەرەی تەمەن کەوتۆتە لێژی وبەرەوەری گوڕوتنی رابردوونەزووی سارد دەکاتەدیاری.تان وپۆ خۆ دەنوێنی وچاوان دەترسێنێ!

زستانەشەوە ،کلۆوکلۆوبەفر داتەقی وبزووی سەرما وسۆڵی راکێشاو خەڵکی لەبن کورسی کێشا.

شەوە ،شەوە خۆی دەدەمک ناوە ،خەفتاوە، پێڵاورەشە بەدشومە، دزێوە، ناتەرزە کێ دەزانێ کێی هەڵناوە ؟

شەوە سروشتی وێنەگەر لەحاند بێکەسی وتەنیایی تاقەداری بناری کێوێدا. چۆکی داداوە وبە ئارامی تێی هەڵدەڕوانێ.

شەوە ،بادامۆکاکڵە گوێزو مێوژو خورما کۆڕو مەجلسان دەرازێننەوە و قسەی زل زل وبەتام وخوێ دەخەنە زاران وسەری چلوان دەخۆن.

شەوە، دیمەنی پیرەپیاوان سرنج راکێشن ،گنجی نووسراوەیەکە من تێیدا سەرگەردانم ،هێڵی کەدن و نووش وباریکی رووەت کە بەرەو کوێستانێ نێ هەڵبۆتەوە، کاروانەرێی پڕرووداوی تاڵ وشیرینە!

بەڵێ شەوە ،نیوەشەوە گەرچی چرا لەشۆقە، نیگامکرە، ماندووم، شەکەتم هەرچەند خۆبانی ژیی وەردەگێڕم ،کلۆشەو وردنابێ تێی ناچم ،کارێکی گران وئەستەمە، بیریش بڕ بکا مێشک دەرنانا!

جاوا چاکە پەنابەرمە بەر لێفەشڕە، شەوگاری درێژ شەو چەلەی زۆری دەوێ.

لەسروەی ژمارە (٧ و ٦) دا دوو بەشی ئەم وت ووێژەتان دیت ئێستاش ئەوە پاشماوەکەی لەم ژمارەدا پێشکەش دەکەین.

پرسیاری ١٠ـ تا ئێستا چ کارێک لەسەر فۆلکلۆری کوردی بەگشتی و لەسەر بەیتەکان بەتایبەتی کراوە؟

وەڵام ـ دەتوانم بڵێم لە قەدەر بەربڵاوی دونیای فۆلکلۆری کوردی هیچ ئەوەی کراوە وپوختەیە کارێکە کەلە هەندەران لەسەر چەند بەیت و حەیران وشتی وا کراوە. ماموستا قادری فەتاحی قازی وماموستا بۆرەکەیی لەنێو خۆدا کاریان لەسەر سێ چوار بەیت کردووە کە دەتوانم بڵێم (بەرجی یەک دوومەبەست کە لە بەرچاویان نەگرتووە) کارەکەیان جوان و لەبارە. دەنا ئەوەندەی چاپ کراوەو بەدەست خەڵکەوەیە یا زۆر ناتەواو بوون یا هەر شیاوی باس کردن نین وخۆزی هەر نەبوایەن.

بەکورتی کار لە سەر بەیتەکان بەو مەیدانی هەراو وبەربڵاوی خۆیەوە کاری ناوەندێکی زۆر دەوڵەمەندی ئەدەبی وفەرهەنگی یە هەتا کاری یەک دووکەس. پێویستی بە زەحمەتێکی زۆر وبێ وچان هەیە. ئاخر کام باری بەیت دەکرێ لەبەر چاو نەگیرێ و فەرامۆش بکرێ؟ فەرهەنگی وشەی بەیتەکان، ئاهەنگ و مۆسیقای بەیتەکان لە باری مێژوویی و جوغرافیایی و کۆمەڵایەتی بەیتەکان، شیعر و چوارچێوەی شیعری بەیتەکان؟ داب وباوو رەسمی کۆمەڵایەتی بەیتەکان؟ ئیستلاحاتی نێو بەیتەکان، لەکامیان؟

کاتێک دەروانی یە فیلمی گوایدێن (فیلمەکەی کوبای یاشی) بەشێکی (بەیتی جندۆ ـ کان)ی عەلی بەردەشانی یە. گوایدێن لەکوێ وعەلی بەردەشانی لەکوێ؟ ژیانی بودا بۆراست وەک رووداوی زەمبیل فرۆش دەچێ؟ تەواوی بەیتی شێخ مەند وشێخ رەش بۆ لە (یشتها)ی زەردەشتدا دەبینی؟ ئایا دەکرێ لە تەواوی ئەو مەبەستانە خۆبوێری و لات وا بێ کارێکیشت کردووە؟ بەداخەوە تا ئەورۆ کارێکی وانەکراوە تەواوی ئەو بارانە بگرێتەوە

پرسیاری ١١ـ لە باری مۆسیقای کۆنی کوردیدا دەڵێی چی. وابزانم پەیوەندێکی راستەوخۆی لەگەڵ ئەم باسە هەیە؟

وەڵام ـ ساڵی ١٣٦٢ هێندێکم بەیت وحەیران لەسەر شریتێک تۆمار کردو دام بە دوستێکی شارەزا تا نۆتی ئەو بەیت و حەیرانانەم بۆ بنووسێتەوە. من لەمۆسیقا هیچ نازانم بەڵام ئەوەی منی دڵنیاتر کردبوو ودۆستەکەمی شاگەشکە،

وت ووێژێک دەگەڵ: ع.خزری

ئەوە بوو کە گوتی :
فلان کەس هێندێک لەو بەیت وحەیرانانە نە تەنیا فالش نین بەڵکوو زۆر رێک و پێکن بەلام یا لە گۆشەی زۆر کۆن وقەدیمی مۆسیقی دان کە هەموو کەس نایانزانێ یا بەو دەزگا ناسراوانە نابیندرێنەوە. ئەگەر لێم بەئیراد نەگری دەلێم زوربەیان لەو دەزگایانەدان کە لە پاش ساسانیەکانەوە بوون و فەراموش کراون.

تەیری دەگەرمێنێ، گەوهەرێ دەشتی دەوژێری، خالۆرێبوار کانەبی و ...سەدان هەوای تر کە هێندێک ئاهەنگی بەیتەکانن وهێندێک بە دەستکاری یەوە کراونەگۆرانی وهێندێکیش وەک رمبازێن و هاوارە بەرەو بووک و خەسوو هەروا ماون. یا ئەو ئاهەنگانەی بۆ نەخۆشی ئەسپەک گرتوو لێ دەدەن وپێی چاک دەبێتەوە.
مۆسیقی کوردی کەس نەبووە

# دۆزینەوەی ئاهەنگی بەیتەکان زۆر چەتوونە وکەم کەس دەیزانێ

ئەوە نیشان دەدا ئەو بەیتانە چەندە دەولەمەند ن هەڵبەت دۆزینەوەی ئاهەنگی بەیتەکان زۆر چەتوونە وکەم کەس دەیزانێ. بەداخەوە بەیتەکان لەو بارەشەوە زەبرێکی گرانیان وێ کەوتووە

●●

کورد هەتا ئەوسالانەی دوایی ئاهەنگسازی نەبووە. وئەوەی لەودەمەشەوە ماوە هونەرێکی تەواو خەڵکی وتەواو کوردی یە. ئەوجار مەبەستێکی زۆرگرینگ ماوە ئەویش هێندێک ئاهەنگ وهەوای مۆسیقی کوردین کە بە شمشاڵ لێدەدرێن. ئەوان بەداخەوە وردە وردە لەنێو دەچن وەک ئەمانە :
ناسروماڵماڵ، حەیران، سوارۆ، رەوتی، ئایشەگوڵ گولێ گولێ، شەپۆلی دەریا باخی سینەم، پایزە لە من، رمبازێن، سەما وهەڵپەرکێ شایی دەگەرێ، هاوارە بەرە شیرین هەلامە، رەزیەی کۆن رەزیەی تازە، بووک و خەسوو جۆرە، لەشکری، لای لایە، گەلۆ سەری پێوە بێشێنی. وبە جێگەی زیندووکردنەوەی ئەوان گۆرانی بێژەکانمان رووبان لە ئاهەنگی غەربی وعەرەبی وتورکی کردووە ئەگەر کارێک لەباری مۆسیقی و گۆرانی کوردی کرابێ بەرادەیەک ناشیانە وناتەواوە کە موحەقیق تەنانەت نەیزانیوە گۆرانی یانی چی و شیعری رەسەن و فۆلکلۆری یانی چی و نۆت نووسین لەم کارەدا چەند پێویستە.

یەکێک لە پەیڕەوانی شیعری گۆران ماموستایەکە بەناوی "ماموستا محەممەد سەدیقی مەحموودی موکریانی" ئەڵبەت ئەو ماموستایە هێشتا نەیتوانیوە شێوەیەکی تایبەتی و سەربەخۆ بدۆزێتەوە. نەوەک قالب و دیوی دەرەوەی شیعرەکانی لەهی گۆران دەچێ بەڵکوو هەر نیوەرۆکی شیعرەکانیشی هەمان نیوەرۆکی شیعری گۆرانە ....

... من لام وایە ئەم شاعیرە هەوێنی شاعیرانەی لەهەستیدا زۆرە و چاوەڕوان دەکرێ بە زوویی رێگای تایبەتی سەربەخۆی، خۆی بدۆزێتەوە.

سوارەی ئیلخانی زادە

# من: محەممەد سەدیق مەحموودی

من ناوم "**محەممەد سەدیق مەحموودی**"یە. بیست وپێنجەمی مانگی رێبەندانی ساڵی (١٣١٦)ی هەتاوی لە "**پاشبلاغ**" کە دێیەکە لەنزیک بۆکان، بەڵام سەربەناوچەی مەهابادە، لە بنەماڵەیەکی ئایینیدا لەدایک بووم.

بابم ناوی **مەلا برایم کوڕی مەلا ساڵحی سەرا**، لە بنەماڵەی زانست پەروەری **مەلاکانی شەمۆلەی** سەردەشت بوو.

لەتەمەنی پێنج ساڵی یەوە لە لای بابم دەستم بەخوێندن کرد. بەمنداڵی بەپێچەوانەی ئێستام" زۆر زیرەک وبەهۆش بووم. لەتەمەنی شەش ساڵیدا پتر لە شەسەت شیعرم لەبەر بوو. دوازدە ساڵانە بووم کە بەگوێرەی رێ ورەوشتی بنەماڵەیم بۆفێربوونی زانستە ئایینیەکان وزمان وئەدەبی عەرەب، چوومە نێو فەقێیان. **لە فێرگە ئایینییەکانی کوردستاندا درێژەم بە خوێندندا**. سەرئەنجام ساڵی (١٣٣٩)ی هەتاوی، لەلایەن ماموستایانی گەورەی ئایینی ساباڵاغ ئیجازەم وەرگرت و لە گوندەکانی "**جەمۆغە**"ی بۆکان و "**تاڵەجەڕ**"ی سەقز دەستم کرد بەدانەوەی دەرسی "**بەلاغە، ئوسوول، مەنتیق، فقە، سەرف و نەحو** بەفەقێیان. ئەم کارەم پتر لە دووساڵی نەخایاند. ژیانی ئەم تەرزە بۆ من زۆر ئەستەم وگران بوو. ناچار دەستم لێ هەڵگرت. وبووم بە ماموستای قوتابخانە دەوڵەتییەکان.

ساڵی (١٣٥٠)ی هەتاوی کارەکەیان گوێزتمەوە بۆ تاران وماوەی شەش ساڵ لەوێ مامەوە. ئەوشەش ساڵەم بەکار وخوێندنەوە رابوارد. رۆژانە دەرسم دەدا وشەوانە دەرسم دەخوێند.

دووساڵ لەزانکۆی ئادابدا دەرسم خوێند وچوار ساڵیش لە زانکۆی حقووقدا.

پاش وەرگرتنی **لیسانسیەی حقووقی قەزایی** گەڕامەوە بۆ مەهاباد وئێستا لەم شارەدا ماموستای قوتابخانەی ناوەندییەکانم.

لەبارەی شیعروشاعیریمەوە پێویستە بڵێم:

هەر لەمنداڵی یەوە شیعرم خۆش دەویست زۆر شاعیرم بە

ناووشوێنەوارەوە دەناسی خۆشم جاروبارە شیعرم دەگوت بەڵام شیعرەکانیشم وەک تەمەنم منداڵانە بوون .

تەمەنم وردە وردە چووە سەر وشیعرەکانیشم باشتر بوون . پێموایە ساڵی (١٣٣٥)ی هەناوی بوو کە لەگەڵ چەن گۆوار و رۆژنامەی فارسی کە لەتاران وتەوریز دەردەچوون،ناغەی هاوکاریم دامەزراند . شیعر وتاری ئەدەبیم بۆ دەناردن و چاپیان دەکرد .ئەوکارە زۆری دڵگەرم کردم وتری هان دام بۆنووسین .

شاوی باسە کە بڵێم :

لەو وەختەدا خۆم شیعرە کوردی یەکانی خۆمم بێ باش نەبوون .نامتوانیبا بەرگریم لە بڵاوبوونەوەیان دەکرد .

لەو سەردەمەدا ، لەتاران **رۆژنامەیەکی کوردی بەناوی "کوردستان"** دەردەچوو .ساڵی (١٣٣٨) هەوەڵین شیعری کوردیم لەودا چاپ کرد . ئەو کارە زاتی شکاندم ،ئیتر لەوە بەدوا بەراشکاوی شیعرە کوردی یەکانم بڵاو دەکردنەوە وەدەمدان بە ئاشنایان و هاوالانی ئەدەب ویستی خۆم .

تەنانەت چەند جارێکیش نووسەرانی بەرنامەی ئەدەبی رادوێی کوردی لە ئێران هێندێک لە شیعرەکانیمان خستە سەر لێکۆڵینەوە وما مۆستایانە شی یان کردنەوە یەکێک لەوان ،برای هونەرمەند و شاعیرم **کاک سوارەی ئێلخانی‌زادە** بوو. یادی بەخێر .

دەتوانم بڵێم هۆی ئەوە دوو شتە :

یەکەم، وەک هەموومان دەزانین لەرژیمی کوشت وبڕی حەمەڕەزای پەهلەویدا . هیچ چەشنە ئازادی یەک لەگۆڕێ دانەبوو. ئازادی زمان و نووسین بەکوردی ودەربڕینی بیروبڕوای دەروون بە

# نیونیگای دلداری

خورەی هەڵدێر ، شمشاڵی شوان
بۆشیعری جوان، ئیلهامی خوان
چەند بەسۆزن، چەند سیحراوین
لای لایەن بۆ کۆرپەی ئەوین

*  *  *

وەختێ کەهات نەورۆزی لاو
زستانی خست لە بەند وباو
ئاسمان لەسوێی گوڵی گوڵشەن
زامی جەرگی دێتە تەشەن

*  *  *

گەلاوێژی ئاسمانی شین
بە پرشنگی جوانی زێڕین
بە زەردەی لێو بەپێکەنین
تین ئەخاتە دڵی ئەوین

*  *  *

دەمی بەیان شنەی شەماڵ
دڵی بێ تین دێنیتە حاڵ
وەنەوشەی کز لەنێو تەما
ئەخاتە نێو کۆڕی سەما

*  *  *

بەپشت پشتی قامکی سروشت
کاتێ کە خۆر پرشنگی رشت
زەوی هەمووی چ دەشت چ کێو
بزەی زێوینی دێتە لێو

*  *  *

بە ئاهەنگی هەوری بەهار
فرمێسکی شادی دێتە خوار
لە چاوی ئاسمانەوە
بە موژدەیی ژیانەوە

*  *  *

باران زەوی دەغەمڵێنێ
دەشتی هەزار بەهەشت دێنێ
خۆی بەدیاری ئەدا بە کێو
گوڵی بزەی گوڵدانی لێو

*  *  *

لە کێووتەل ، دەشت و چیا
لەسەر پەڕەی گوڵ یاگیا
چەن نەخشینە و چەن جوان ئاونگ
کاتێ کە لێی دا پرشنگ !

*  *  *

وشە وتریفەی مانگەشەو
لە سووچی دڵ ئەدا پرتەو
ئەخاتە ناو ئاگری سوور
تاسە، مەیل ، هەست وشعوور

*  *  *

ئەواند گشت ئەدەن بەگیان
ژیان وما ن بەڵام کامیان
وەک نیونیگای هی دلداریــن
ئاوا لەناخی دڵ کارین ؟!

*  *  *

تایبەتی لەچوارچێوەی نووسیندا ، وەک هەموومافەکانی دیکەی ئەم نەتەوەیە پێ شیل کرابوو. پتر لەدەیان جار بەتایبەتی ساڵەکانی ( ١٣٤٣ ) (١٣٤٧ ) ، (١٣٤٨ ) کەئەو رژیمە گڵاوە شاڵاوی دەهێنا سەر کوردستان وکوردەئازادیخوازەکانی لەخوێندا دەگەوزاند ومەئموورەکان شەوونیوەشەو بەسەر خەڵکیان دادەدا وماڵان دەگەڕان ،ناچار دەبووم شیعرەکانی خۆم بسووتێنم "چونکوو فریای شاردنەوەیان نەدەکەوتم".

دووهەم ،خۆم ئادەمیزادێکی بێ مشوور بووم، کەم جاری واهەبوو شیعرەکانم بەجوانی بنووسمەوە وهەڵیان گرم. سەرەڕای ئەمەش گەلێک جار ئاشناکانم شیعریان لێ وەردەگرتم وبەڵێنی یان دەدا دوای نووسینەوە بۆم بێننەوە. کەچی ئێستاش چاوم پێیان نەکەوتەوە. شیعری ئەم کتێبە تەنیا ئەو شیعرانەن کە لەحافیزەمدا عەمبار کرابوون و لەبیرم نەچووبوونەوە.

بیروڕام سەبارەت بەشیعر

من لاموایە کۆشکی بەرزی شیعر ، لەسەر سێ پایەی "زمان" و "بیر" و "خەیاڵ" دامەزراوە. لابردنی هەرکام لەو پایانە دەبنە هۆی تێک رووخانی ئەم کۆشکە.

من بڕوام بە "فۆرمالیسم" و "ایماژیسم" نیە. لە شیعردا تەنیا ئەشکی شیعرو وردەکاری وشەوزمان،یا تەنیا پایەی خەیاڵ گرینگە.

هەروەها لەسەر ئەو بڕوایەش نیم کە بیروفکری نێو چوارچێوەی شیعر لە دوانەکەی دیکە پێویستترە. شیعری باش شیعرێکە کە.لە هیچکام لەو سێ روانگەوە لاوازی وکەموکووڕی نەبێ.

شیعری کۆن ونوێ

من واتێدەگەم کەچوارچێوە وقالبی شیعری باش دەکرێ نوێ بێ ودەکرێ کونێ عەرووزی بێ. مەبەستم ئەوەیە کە تەنیا میعیار وتەرازووی چاکی و خراپی شیعر ئەو سێ کەرەسە شیعری یە کە لەپێشدا باسم کرد یانی(خەیاڵ وزمان وفکر) ئیدی قالب وچوارچێوەی هۆنراوە هیچ شوێنێکی لە باشی وخراپی شیعردا نیە.

لێکۆڵینەوە سەبارەت بەو سێ عونسورەی شیعر پێویستی بە باسێکی ورد و درێژ هەیە کە ناتوانم لەمکورتە وتارەدا لەبارەیەوە بدوێم. هیوادارم لە سەرەتای کتێبەکانی داهاتوومدا بتوانم ئەمباسە بەجوانی شی بکەمەوە.

## شاعیرێکی کورد

چل ویەک ساڵ
بەر لەئێستا
لە پاشبڵاغ لادێ یەکی موکریانا
لوێچێ هەست و
مستێ خەفەت
تێکەڵ کران
باش لێک دران
کۆرپەیەکی لێ بەدی هات ....
کۆرپەی دایکی لێوبەباری و
بابی داماوی هەژاری
ئێستا ئەوە
شاعیرێکە
شاعیرێکی ماتوکڕی
دڵ پڕگڕی
کوردەواری .

ماموستا محەممەدسەدیقی مەحموودی لەرێزەی ئەوشاعیرە گەورانەیە کە خزمەتێکی زۆریان بەزمان و فەرهەنگی گەلەکەیان کردووە .ئەمشاعیرە هونەرمەندە زۆر خەتخۆش بووە ولەم رشتەدا ناوبانگی بووە .

... تا رۆژی شازدەی خەرمانان ساڵی ١٣٦٣ بەهۆی لێکدانی ماشێن کۆچی دوایی کرد .

# جوغرافیای شارستانی بانە

(٢)

رەئووف وسووقی
حاجی رەئووف سەلیمی

**وەزعی ئینسانی**

بەپێی سەرژمێری ساڵی ٦٢ی هەتاوی شارستانی بانە (٦٣٩١٦) کەسە کە (٢٥٠٠٠)کەس لە شاری بانە نیشتەجێن و (٣٩٠٠٠) کەسیش لە گوندەکانی سەربەم شارستانە.

رادەی هەڵدانی حەشیمەت ساڵێ (٢/٦) لە سەدە. ئەویش بەهۆی ئەمە کە (**کوتان**) بەرگری لە مردنی منداڵەکان دەکا. لاوەکان بەپێی بیر و باوەڕی ئایینیەوە زوو ژن دێنن و خێزانی زۆر لە کاری کشت و کاڵ و ئاژەڵداری یارمەتی یان دەدا.

**ناوچەکان**

شارستانی بانە بە چوار ناوچەدا بەش دەکرێ.

١ـ ناوچەی **نمەشیر**

٢ـ ناوچەی **ئالۆت**

٣ـ ناوچەی **نەگور**

٤ـ ناوچەی **ئارمردە**

جگە لەم دابەشینە خەڵکی ناوچە بۆ خۆیان ناوی خۆماڵی یان لەمەڵبەندەکان ناوە وەکوو دەشتەتاڵ کە بەناوچەی **نمەشیر**دەگوترێ. **پشت ئاربەبا** بە ناوچەی **ئارمردە** دەگوترێ. بەناوچەی ئالۆت دەڵێن بەرڕێ یا **مازوان** بەن.

**زمان**

زمانی خەڵکی شارستانی بانە **کوردی نێوەراستە**. گوندەکان بەهۆی نزیکی لە

شارستانەکانی دیکە بە زاراوەی **موکری**، **مەنگوڕی** **مامەشی**، **سولیسنی**، **سەقزی** **سنەیی** و **سولەیمانی** قسە دەکەن. کورد هەر وەکوو رەگەزەکانی دیکەی ئێران ئاریایین. زمانی کوردی پیت ووشە وڕێزمانی تایبەتی خۆی هەیە وبزوێنەکانیشی بەپیت دەنووسرێن.

**داب ورەسم**

ئەم شارستانە بەهۆی ئەوە کە چواردەوری بە کێو تەنراوە خەڵکەکەی لەگەڵ **وڵاتانی دەرەوە هاتوچۆیان** کەمتر بووە و **شارستانەتی** نوێ کەمتری کار **تێکردوون** هەر بۆیە **ئەو دابورەسمەی**

له باوباپیرانەوە بۆی بەجێ ماوە پارێزراوە و بەم شێوەیە دەستی لێ نەدراوە. وەکوو بەڕێوەبردنی **جەژنی نەورۆز، زەماوەند، جل و بەرگ**وهێندێک باوەڕی کۆنی دی.

لەگەل ئەوەشدا خەلکەکە **موسلمانێکی ساغن**، نوێژکەرو ڕۆژووگرو خواناسن، و **جەژنی قوربان** و ڕەمەزانیش زۆر بە جوانی بەڕێوە دەبەن.

**پێشینە مێژوو**

شاری بانە قەدیم ناوی بەرۆژە بووە کە ئێستاش پاشماوەی ئەوشارە لە نزیک شیمالی شار ماوەوپێی دەلێن بەرۆژەکۆن.

بەر لەئیسلام تیرەیەک بەسەر ئەو هەرێمەدا فەرما ـ نڕەوایی‌یان کردووە کەپێیان گوتراوە **قەقۆ** ئێستاش شوێنەواری قەلاکانیان لە هێندێک شوێن ماوەتەوە وپێی دەلێن **قەلای قەقۆ** کە زەردەشتی بوون.

کاتێک لەشکری ئیسلام دەگاتە ئەم مەلبەندە لە گەلیان بەشەڕ دێن و لە نێویان دەبەن. دوای ئەوان فەرمان دەکەوێتە دەست **ئیختاردینی**یەکان واتە ئەوانە کە بەدلخوازی خۆیان دینی ئیسلامیان هەلبژاردووە.

پێش شەڕی یەکەمی جیهانی خانەکان بەسەر ئیختاردینی یەکاندا زال دەبن. دەلێن

یەکێک لەوان بەناوی سلەمان بەگ پیاوی خوا بووە وئێستا مەرقەدەکەی بۆتە شەخس و خەلک زیارەتی دەکەن.

شاری بانە جارێک لەشەڕی یەکەمی جیهانیدا سووتا. جارێکی دی لە شەڕی دووەمدا، سووتا ولەشەڕی داسەپاوی عێراق بەسەر ئێرانیشدا تا ئێستا (کە ئەم وتارە دەخوێننەوە) سی وهەشت جار بۆمباران کراوە. جا لەبەر ئەوە بە بانە دەلێن بانە سووتاو یا بانە کلۆل.

دوای شەڕی یەکەمی جیهانی قاتی وقڕی لێ پەیدا بوو. وەکی پیرەکان دەگێڕنەوە ئینسان، ئینسانی خواردووە. لەم نێوەدا هەشتا لە سەدی خەلک تێدا دەچن.

شارستانی بانە بە هۆی ئەوە کە لەسنووری ئێران و عێراق هەلکەوتووە هەمیشە مەیدانی شەڕ و لێدان وبگرەو بەردە بووە وخەلکەکەی نەحەساونەوە.

تیرەی ئەردەلان لە سنە لەگەل تیرەی بابان و جاف لەسلێمانی هەموو سالێک لە بانە ومەریوان وشارەزوور، شەڕێکی خوێناوی‌یان کردووە لەو نێوەدا چەند هەزارکەس کوژراون. بانی کوردی بێ تاوان بۆتە قوربانی ویستی شای ئێران وعوسمانی ـ یەکان.

**وەزعی کۆمەلایەتی**

چون شارستانی بانە لە ناوچەیەکی کوێستانی و چڕ و نزار هەلکەوتووە. خەلک لە بەرامبەر گیروگرفت و تەنگ و چەلەمەدا بە سەبرن. لە تەنگانەدا خەمخۆری یەکترن و لە کۆنەوە بە میواندار بەناوبانگن. موسلمان و خوا ناس لەبەر ئەوەیە کە شارێکی وەک بانە **بیست و پێنج** مزگەوتی لێیە. هەموو گوندەکانیشی مزگەوتیان هەیە هەموو مزگەوتێک ئاوی لوولەکێشی وئاودەستی بێهداشتی هەیە. مزگەوتی جامیعەی شاری بانە **٧٥٠** میتری چوارگۆشەیە وجێی چەند هەزارکەس دەبێتەوە

## وەزعی ئابووری

بەهۆی شاخاوی بوونی ناوچە و لەبەر ئەمە کە زەوی‌یەکان لە دەراوی

چۆمەکان بڵیندترن کشت وکاڵ دێمەیە وپیشەی خەڵک پتر ئاژەڵداری‌یە. ئەگەر کشت و کاڵیش هەبێ بە شێوەیەکی سەرەتایی وخۆماڵی‌یە وتراکتۆر وکۆمباین لەم نێوە بێ سوودە تۆو وکوودی شیمیایی‌شیان پێ ناگا.

لە لایەکی دیکەوە ناتوانن ئاڵف وتفاقی مەڕومالات لە زستاندا دابین بکەن. لە بەرامبەر نەخۆشی ئاژەڵ و ئافەتی کشت وکاڵ دەستەوەستانن. هەر بۆیە جگە لە کشت وکاڵ وئاژەڵداری کاری دیکەشی بە بەرەوە دەکەن.

کاروباری خەڵکی شارزیاتر دوکانداری وکڕین وفرۆشتنە. بەپێی سەرژمێری تازە :

| | |
|---|---|
| کرێکار | ۱۲۰۰ کەسە |
| کاسپی سادە | ۱۰۰۰ کەسە |
| چەرچی | ۲۰۰ کەسە |
| شوفێر | ۸۰۰ کەسە |
| دوکاندار | ۱۴۰۰ کەسە |
| بەننا | ۳۰۰ کەسە |
| کارمەند | ۲۴۰۰ کەسە |
| جووتیاری شار | ۵۰ کەسە |
| بازنشستە | ۱۰۰ کەسە |
| بێکار | ۵۰۰ کەسە |
| ژنی کەیبانوو | ۶۰۰۰ کەسە |
| بێکار | ۱۰۰۰ کەسە |
| قوتابی سەرەتایی | ۳۲۰۰ کەسە |
| ڕاهنمایی | ۱۴۵۰ کەسە |
| ناوەندی | ۱۰۰۰ کەسە |
| منداڵ | ۹۵۰۰ کەسە |
| پیر | ۲۰۰۰ کەسە |

### ئاڵف وتفاقی ئاژەڵ

ئاڵف وتفاقی ئاژەڵ بژێتی‌یە لە هەڵز، کەما سەوزەگیا، وێنجە، شەوەر، گەڵای نزار کە پاییزان بە تەوەرداس لق وپۆپی داربەروو ودار مازوو هەڵدەپەرتێنن و لەسەر لقی دارێکی گەورە لە تایەی دەدەن کە (قۆریەگەڵا) ی پێدەڵێن. زستانان لەنێو بەفر بۆ ئاژەڵ بڵاوی دەکەنەوە

وئەگەر زۆر سارد بوو ئاژەڵ دەر ناکەن بەڵکوو بە کۆڵ گەڵاکە دێننەوە ماڵ ودەیدەن بە ئاژەڵ.

تێبینی وسەرنج دان لە کاتی کایەکردندا ، یەکێک لەو کەرەسە هەرە گرینگانەیە کە لە کۆنەوە کردەوەناس ورەوان ناس بۆ ناسینی دەروونی منداڵ وەبەر چاویان گرتووە .

کایەکردن نەخشێکی هەرە جوانی خودایە بۆ هەڵدان و گەشەی منداڵ چ لەباری رەوان وچ لەباری لەشەوە .

کایە هەل و مەرجێک پێک دێنێ کە مامۆستا بەوردی لە دڵ ودەروونی منداڵ بگا و بۆ چوونەکانی جۆراوجۆری ئەو بە شێوەیەکی بنەڕەتی شی بکاتەوە چونکوو منداڵ لە کاتی کایە کردندا هەست بەسەربەستی دەکا وئەو شتانە کە بە هێندێک هۆ نەیدرکاندووە و نەیهێناوەتە روو ، بێ هیچ ترس و خۆفێک لە خۆی نیشان دەدا وئەوجۆرەی کە هەیە خۆ دەناسێنێ .

کایە زۆرباشترلەوقانوونە دەستکردانەی بەشەر ، منداڵ بۆ لەبەرچاوگرتنی رێک و پێکی هان دەدا و زۆربەجوانی فێری دەکا کە بەرەوپێش بردنی کۆمەڵ پێویستی بەرێک وپێکی تایبەتی خۆی هەیە . منداڵ رێک وپێکی نێوکومەڵ فێر دەبێ وبەدەست پێکردنی کایە یەکەم هەنگاو بۆ پەرە گرتن وهەڵدانی خۆی هەڵد ـــ ێنێتەوە وبەراستی چۆنەتی ژیان فێر دەبێ،پێی هەڵدەدا ، خۆی پێ دەنوێنێ،لێهاتوویی نەهێنی خۆی کە لەحاڵی پەرە گرتندایە بەجوانترین شێوە وەدیار دەخا .

بەراستی ئەگەر ژیانی ئەمرۆی یەکێک پڕ لەخۆشی یە یاخۆ گیرۆدەی خەمە ، ئەگەر باغی ژیانی پڕبریای بێ بەرە ئەگەر مەندوهێدی و هێمنە ،یا بزۆز و سەربزێوە ، ئەگەر لە خەم وشادی خەڵکدا شەریکە ،یا دوورکەوتەوتەریکە ، ماکەی دەگەرێتەوە سەر چۆنەتی

بارهاتن وپەروەردەبوونی .

منداڵێک کە لەژینیدا ئەو هەلەی بۆپێک دێ دەستی وەکار بخا ،تامی هەستان و کەوتن بچێژێ ، هەڵبەز دابەز بکا ، دەوروبەری خۆی بپشکنێتەوە شتی تازە سەرنجی بۆ لای خۆی رابکێشێ ،جگە لەوە کە هێز و ورەی پێ زیاد دەبێ چاو و گوێشی دەکرێتەوە . شتی تازە فێر دەبێ وشوێن لەسەررەوانی دادەنێ ولەبار هاتن و پەروەردەبوونی شەخسی یەتی ئەودادەورێکی بەرچاودەگێرێ.

ئەو منداڵە کەلە نیعمەتی کایەکردن لەگەڵ هاوتەمەنانی خۆی بێ بەشە ، کەللەرەق و لاساروگۆشەگیر وتەریک باردێ. چونکە رێ و شوێنی ژیانی کۆمەڵایەتی دەبێ لەنێوکۆمەڵدا فێربێ .ئاموشۆکردن هەستان و دانیشتن لەکۆمەڵ، کایەکردنی ئازاد لەکۆمەڵ و سەرکەوتن و تێشکان منداڵ فێری ئەمەدەکا کە تامی هەموو ئەوانەبچێژێ ئەودەم دەتوانێ خۆ لەگەڵ کۆمەڵ رێک بخا وبەبەرژەوەندی حاڵی خۆی بجوولێتەوە .هەروەها راستی وخەیاڵ لێک هەڵاوێرێ . منداڵ لەکاتی کایەکردندا تێدەگا کە چۆن دەبێ لەنێو منداڵان خۆشەویست بێ وشەرتی بنەرەتی پێک هاتنی ئەو خۆشەویستی یەش ئەوەیە کە دەبێ بەرەحم ولەسەرەخۆوراست گۆ وراستکردار بێ .هەروەها ئەگەر لە کایەدا هەڵەی کرد چۆن وەبەر لۆمە و تەشەری هاواڵەکانی دەکەوێ و لە هێندێک شت بێ بەش دەکرێ .لە ئاکامدا زۆرتر پابەندی "نەزم"ی نێو کۆمەڵ دەبێ و لە هەڵەباشی و کەمتەرخەمی خۆ دەپارێزێ .

مەسەلەیەکی دیکەش لەکایە کردندا گرینگە ئەویش ئەوەیە کە منداڵ کایە دەکا هەتا کەیفی ساز بێ، یانی"ئەسڵی لەزەت" لەبەرامبەر" ئەسڵی واقیع"دایە ئەم قسەمەنشوورە ی "زیگمۆندفرۆید" ،کردارناس ورەوان ناسی ئوتریشی یە کە دەڵێ :

**"منداڵ لەکاتی پەرەگرتن وهەڵدانی خۆیدا لە "ئەسڵی لەزەت" پەیرەوی دەکا و ئەگەر گەورە بوو لە "ئەسڵی واقیع"، پەیرەوی دەکا . بێ ئەوە کە "ئەسڵی لەزەت" بە یەکجاری لەودا بفەوتێ ."**

هەڵبەت منداڵ هەمیشە بۆ لەزەتکایە ناکا بەڵکووجاری وایە ، کایەی وا دەکا کە رووی نالەباری ژیانی ناچاری دەکا بەڵام بەگشتی کابەکردن هێندێک لەو شێوەکردارەی منداڵ کە دژایەتی لەگەڵیەک هەیە وردە ،وردە لەنێو دەچێ. مرچ ومۆنی ودژوگرژی جێی خۆیان دەدەن بە بزەوسەرورِوو خۆشی .

بۆیە ئێستا لە هێندێک شوێن بۆ چارەسەرکردنی ئەم چەشنە نەخۆشی یانەی کە دەگەرێنەوە سەررەوانی منداڵ لە کایەکردنی ئەولەکۆمەڵدا کەلک وەردەگرن .

# بەهار

سەید کامیل

ئەورۆ بەها رە، سەیری چەمەن خۆشەخوا روژوور
را زاوە با ش.بەسەرو وچنا روگوڵ وچنوور
گیا سەوزو جۆگەسەوز وگەڵا سەوز وبێشە سەوز
گوڵ گەش ،هەڵاڵەزەردو چەمەن شین وخونچە سوور
بەم سەوز وسوورە بوو دڵی ئا شق کە هەڵکزا
پشکۆی لەنێو خزاوە،دەسووتێ وەکوو تەنوور
شمشاڵە ، تارە، سازە،ئەگەر بیانوو ناگری
ساقی کەرەم کە، پیاڵە ، مەترسە (هوالغفور)
هاتوونەوە بەجام،کوڕو کیژانی دڵرفێن
هەرکەس کەبێ گوڵ ودڵە،لاچێ بچێتە ژوور
زاوایە ئێستە بولبول وگوڵ خونچە بووکی یە
خاوەن سلووکە،کەوتووە لەولا قونەوتلوور
کویستانە پڕلە رازونیازو زمانی حاڵ
جێگە وهومێدی هەستە، دڵە بۆتە کێوی توور
لەم کانە هەرکەسێ بە خەیاڵ وبەفکری ژین
هەر بولبولە لەگوڵ بەگوڵ بەکوڵە ،ماوەبێ‌مشوور
هەرچاوەرێ یە بەڵکوو دەمی خونچە پێکەنێ
هەڵنیشتووە لەباخ ودەکا زیکری یا سەبوور
ئاواتی ئاخۆ گەنگێ بەجێ دێ لە گوڵشەنا
ئەوشێت و وێتی دڵ بەکوڵی مەستی بێ شعوور

# مەلای جزیری

دەستی قودرەت کو هلاقیت ژ بەژنا تە نقاب
ب چەمالا جە بە رووتی مەنەمان پەردە، حجاب
ل گولین تەی تەرونا زک کوسەحەرگرتی خوناف
دئەباریق وقنینان ژحەسەد سوهتی گولاب
عەینی کافوورییە مەشرەب مەژحوسناتە یەساف
لەوژعیشقاتە ددلدا مە قەبووعلمی عوباب
مەژسەرچەشمەئی حەیوان قەدەحەک سافی قەخار
ناگەهی لەززەت وزەوقا مەب سەد جلدی کتاب
لەودچەنگی مەدخوونی کود عیشقاتەب ساز
مەب بەژناتە دخوونن نەی وقانوون وروباب
قەهوەیاتەلخ دگەل زەهر هەلاهل بدەری
مەژدەستی تەموبارەک شەکەر ئامیزە گولاب
قولزومی عیشقی ژبابی خو موخالف دەمەکی
دهەماماتی عەجاجی،مەل سەر دەستە غوراب
سەحەری خزری عینایەت کوبرین چەشمەئی دل
ب جهانی مەنەزەردا کوجهان عەینی سەراب
ب حوبابی مەبە مەغروور وەهەسەرگەشتە "مەلا"
ساقبەرکەفتییە وی بیهوودە سەرگەشتە حوباب
وەیە هودهود ژسەبابیت وبزانین چیە حال
کول حالی مەغەریبان نەسوئال ونەجەزاب
هەردوو برهین تەنە میحراب ج ئیمان وچکوفر
بوودونا بوود کویەکن ئەف ج سەواب وچ عیقاب
وەرەنیشانی"نیشانی" دەخوە بی پەردە سەحەر
لی ژخوونی بکە پەرهیز کوشەهیدان ج حساب

دنیا کەتیامانی کش ماتێکە
سەدساڵی ئەگەر تیابژی ساتێکە
رابردوونەما ،نەهاتوو نازانی چیە
ئەوهاتن وچوونە هەریەک ئافاتێکە

حەقیقی

## بەهار

س.ج بێزامی

حا صلا بها ری شین دکەت رونا دلی غەمگین دکەت
هەر تالیا ن شیرین دکەت ها تیە هەیا می خوشیا
شقا ن دبەت پەز بو دەری حەتا سپیدا سحەری
نیقرو کو ها ت وا ن بیر دکەت جندی یە مەشیا بیریا
فیستا ن سپی وصور دکەن تژی دبن سەر کا نیا
جەر لسەر پشتی دبەن سا تل بدەستی زەریا
زستا ن بهوری ها ت بها ر گەرمە دونیا نینە سا ر
سا ل ب سا ل خوزی ب پا ر ،نەوروزە روژا خوزیا

سەدخۆزگە دەمێکی تۆوی گەنمی دەڕوا
با پیرە بەشەیتانی نەبووبا بڕوا
لەوساوە منالّی داکەوا وبا بەدەمێ
ڕۆژی لەشەوی ڕەشترە هەردێ ودەروا!

حەقیقی

## بەهار

« ئەحمەدخانی »

دەورا فەلەکی ژ بەختی فەیروز
دیسا ن کو نما ژ نوقە نەوروز
مەنبی ل وی عادەتی مبا رەک
شەهری و سوپاهیا ن ب جا رەک
با ژیر و کەلات و خانی بەردان
تەشبیە ب نژدەیا ن و جەردان
صف صف دمەسینە کوە و دەشتان
رەف رەف دخوشینە سەیرو گەشتان
اصنا فی امم صغا ر و کبا ر
قطعا " قە نەما د شەهری دیا ر
هندەک ب پەیا یی چونە با غان
هندەک ب سوا ری چونە را غان
هندەک ب تەبا یی و ب کثرەت
هندەک ب هەقا لی و ب وەحدەت
را بونە قە خانم و خواتین
وا ن ژی تژی گول کرن بسا تین
سەر سا لی و با کر و روالا ن
صەد سا لی و جوا ن وپیر و کالان
سەر سا ل لرەسم و را هی مەعهود
گیرا ن دچو مەقا می کەحمود

## بەهار

« ئەفخەمی »

نەورۆزە وەرە سەیری چیا کاتی بەهارە
وەختی ئاوازی مەل و گەشتی دەرودیتنی یارە

سێروو بە سروودێکی دڵ ئاوێزەوە دەیڵێ
زستانی بە سەخڵەت گوزەرا رۆیی پەژارە

بلوێری شەماڵ باخی هێنا بەزم و زەماوەند
ها تۆتە سەما سەر چڵی هەرچی لکی دارە

بۆ دیمەنی گوڵزار و گوڵ و خنچەیی ساوا
بولبول لە هەموو سەرچڵ و پۆپێ حەکەدارە

سووسەن بە زمانێکی تەڕ و تازەوە دەیڵێ
فەسڵی گوڵە نەشئەی دڵە سۆزی نەی و تارە

دەشنێ بەدەمی سروەوە سەرپۆپی چڵی بی
باخ دیمەنی سەیرانی مەل وڕەقسی چنارە

هەر دوند و ترووپکێکی دەبینی لە کەژ و کێو
قاسپەی کەوی کوێستانی بە هاواری منارە

هەر چیمەن و مێرگ و چیایێکی دەبینی
ڕەشماڵە هەموو چادرە خێڵاتی هەوارە

شەونم دەتروسکێ وەکوو دوڕ دەتکێتە سەرگوڵ
وەک عارەقی سەر کوڵمی گەش وسووری نیگارە

سووسەنبەر و نەسرین و وەنەوشەوگوڵی سوێسن
ملوێنکی ملی بووکی دڵ ئەپسێنێ بەهارە

وەک ئەفخەمی لەو سەنعەتە بێ وێنە سەرنج دە
ئەو نەقشە کە دەستکردی هەرئەو سانیعی پارە

# ههڵوهدا

ج. ئاشتی

بهاتنی "قاسم" دهبوو شهش کهس له دیوێکی سێ و چواردا ههستین ودانیشین ، هیچمان ئهوهندهمان دهست نهدهرۆیشت لهوشاره گهورهدا تاقه هۆدهیهکیش بهکرێ بگرین ناچار لهجێ خهوی ئهو یانهی کارمان لێدهکرد ههرچۆنێک بوو دهحاواینهوه . دوو سێ یهک سهبارهت بهدهرس خوێندن له زانستگه ودوو سێ یهکیش له تاوی بێکاری ، له زێد و مهڵبهندی خۆمان دوور کهوتبووینهوه ،تهنیا "قاسم" بوو که زریقهوبریقهی شاری "ت" وخهیاڵی ههڵدانی منداڵهکانی و گهشهکردنی ئیستعدادی هونهری خۆی که بریتی بێ له "فیلمبهرداری" بههۆی دهرهتانی زۆری کار و ژیان لهوشاره ، خستبوویه نێو گێژاوی خهم وکهسهری دهردی دووری.

سێ چوار مانگ بوو ، لهو رۆژهوه که دوای هات و چۆ و زارخوارکردنهوه و پهت پهتێنێکی زۆر وگواستنهوهی شوێنی کارهکهی جێ بهجێ ببوو ، وهک داڵ به شوێن چاوهخانوویهکدا دهگهرا ، بهڵکوو بتوانێ زووتر ژن و منداڵهکهی بێنێته لای خۆی . بهش بهحاڵی خۆم دهمزانی چ دهچێژێ ،ههرچهند وهکوو ئهو باوک نهبووم ، بهڵام دووری له خۆشهویستانم دیتبوو ،دهمزانی چ دهردێکی گرانه لهبهر ئهوه ههینده گوێم بۆدهردی دڵهکانی شل کردبوو ببوومه مشوورخۆری.

ئێوارهی رۆژێکی مانگی گهلاوێژ که تازه گهیشتبوومهوه مزڵهکهمان وخهریک بووم لاقان راکێشم وبحهسێمهوه هاتهوه و داوای لێکردم وهدهرکهوین . ههرچهند که کاری رۆژانه و دانیشتنی چهند سهعاتهی نێو ماشێن بهگهرمای بێ ئامانی هاوین برستی لێ بریبووم ، بهڵام دیتم کهزۆر بهتێراد- یوی پێی گوتم . لهبهر ئهوه بێ قسهییم نهکرد و خۆمساز کرد .گوتم :بچینه کوێ ؟گوتی :

- دهچین بۆلای مهیدانی "ت" زۆرم ئیشتیا له گۆشتاوه . بهناشکوری نهبێ خۆ لهو دهوروبهرانه خواردنی مهمانان پهیدا نابێ، باوهر که وهخته بۆ کهوچکه شۆرباوێک سوێم بچێ "

قسهکهی بهدڵمهوه نووسا ، ئێمهی له گوند و شارۆچکه پهرهوازه بووی پهریوهی شاری پر زهرق وبهرق و ههراو گرمه که به مووچهی کارمهندێکی سادهوه دهژیاین بۆ بهدبهختی لهجێیهک دهژیاین که به وێنهی مانگ... ی قهشان لهنێو خهڵکی ئهو گهرهکهدا دیاربووین، نه جل وبهرگیان ، نه ههستان و دانیشتنیان ، نه خواردنیان، هیچ شتێکیان وهکوو ئێمه نهدهچوو. جگه لهوه که ئهوانیش وئێمهش ئادهمیزاد بووین .

سهعات شهش ونیو بوو که وهدهرکهوتین . گهیشتینه سهر شهقام ولهسهر تاکسی راوهستاین . "قاسم" کهلهو ماوهدا لهبن لێویهوه ورتهی دههات رووی تێکردم وگوتی:

- ئهگهر ئهو خانووبهرهی که دهڵێم ...

لهتاوی تاکسی قسهکهییم بری و بهپهله گوتم: ئهوه تاکسی هات . دهستم له تاکسی ههڵێنا ودهنگم بڵیند کرد :

"مهیدانی "ت" تاکسی یهکه چهند ههنگاو ئهولاتر رایگرت بهپهله خۆمان گهیاندێ وسوار بووین وتاکسی وهرێ کهوتهوه . هێشتا تهواو پالم نهدابۆوه ، "قاسم" بهدهنگێک که بۆنی خۆزگه وبریای لێدههات گوتی :

- ئهگهر سهودای ئهو خانووبهرهیه سهری بگرتایه ،

بەراستی ...."
هەروا جنێوی دەدا .تووڕەیی لە سەروچاوی دەباری،لەسەرەخۆ گوتم :

ـ براله هێندە نارەحەتی‌یەی‌پێ ناوێ،تازە کار هاتووە ئەوە ئەلحەملای ئەو خانووبەرەت‌دۆزیوەتەوە ، خودا یاربێ جێ بەجێش‌دەبێ لەخۆڕا بۆ خوێنی خۆت‌پیس دەکەی ... ؟"

زۆر بە مل کزی گوتی :

ـ "کورە ئاخر چۆن نارەحەت‌نەبم، وەڵڵاهی شەو و ڕۆژ ماڵ ومنداڵم لەبەرچاوە، لەوانەیە خێزانیشم ئێستا پێی وابێ دەستم لەسەر دەست داناوە وبە شوێن خانوودا ناگەڕێم نازانم چ بکەم ،جاری وایە وەختە شێت‌بم ..."

لەمێژ بوو لە دەرفەتێکی ئاوا دەگەڕام. زۆربەشێنەیی و لەسەرەخۆ گوتم :

ـ کاک "قاسم" هەرچەند کە تۆ چەند کراست‌پتر لە من دڕیوە و دنیادیدەتری بەڵام قسەی خۆمان بێ بە دەردی قەدیمی گوتەنی سەرت نەیەشاوە پرێسکەت‌لێ بەستووە ئەگەر فریوی تروسک وبروسکی ئەو شارە دوورکوژە ، نزیک خەسارەت‌نەخواردبا ئەوڕۆ ئەوەت‌نەدەگوت ...."

دوو ،سێ هەنگاو بەبێ دەنگی ڕۆیشتین ئەمجار گوتی : تەمایە و گرتوومە دەنا قسەکەت‌لێ دەسەلمێنم ."

ئیتر چی دیکەی نەگوت وسەری بەرداوە. منیش‌کەوام دیت دەنگم نەکرد ، نەوەکوو پەرۆشتر بێ. هەروا کە بە پێی یەک دەرۆیشتین گەیشتینە ڕاستی پارکی "م". شوێنێکی قەرەباڵغ بوو، بە تایبەتی ئەو وەختانە کە هەوا وردە وردە بوو لێڵ دەبوو. بەخۆم گوت‌واباشە بچینە نێوپارک و هەندێک بخولێینەوە، بەڵکوو قاسمیش‌لەوحاڵە بێتە دەر و چی تر باسی خانووبەرە نەکا.

دەرگای پارکەکە ڕاست‌لەو بەری شەقام بوو، ئێمەش پەڕینەوە بەر دەرگاکە وەکوو هەموو ئێواران لەخەڵک‌جمەی دەهات. هاواری سیگاروبەلال و وردەواڵە فرۆش نووکە نووک وزیقەی منداڵان بۆ بەرزەحەوایلە وپزدان،پیاوان کەڕ دەکرد. بە پاڵەوپەستۆ چووینە ژوور. هەر لەپێشەوە، دە پازدە هەنگاو ئەولاتر دەستەیەک لەدەوری چوارپێیەک هاڵا بوون وقاقاوتریقەیان دەگەیشتە بەردەرگــا. دیتم هەلی چاکە، چونکە "قاسم" بە زمانی خەڵکی ئەوشارە جوان دەدوا، ئەگەر وازیشی بوایە زۆر حەزی بەگاڵتە وجەفەنگ دەکرد و کۆڕ و بەزمی ئەوتۆی باش‌گەرم دەکرد، لەبەر ئەوە گوتم :

ـ ئەرێ نەچینە لای ئەوانە بزانین چ باسە ؟

ـ باشە فەرموو ئەمن قسەم نیە."

وای وەڵام دامەوە کەدیاربوو هەروالە گێژاوی فکری خانووبەرە و ژن ومنداڵ دایە و گوێی لەهەراو گرمەی دەورو بەر نیە. لەسەرەخۆ لە ئاپۆرەکە نزیک بووینەوە ولە نێویاندا ڕاوەستاین. قەپە گۆڵێکی رووتەی ئاماڵ سووری زەلام لەنێو جەماوەرەکە لەسەر پاشوویان هەڵتووتەکا ـ بوو. قەڵادەیەکی زێڕکفتی لەمل دابوو. بەسەروسەکوتی گورگانە و کلکی شووش و باریکیرا دیار بوو کە لە جسنەسەگی هەندەرانە. لاوێکی قیت وقۆزی کەڵەگەت‌پەتی سەگەکەی بەدەستەوە بوو ، خەڵکەکە هەر یەکەی پرسیارێکیان لێ دەکرد. هی کام وڵاتە ؟ چەند ساڵە هەتە؟ ئەرێ گورگ خنکێنە؟ نایفرۆشی بەچەندت‌کڕیوە؟ کوڕەش وەک ئەوە کە وەڵامی پرسیارگەلێکی زۆر گرینگ بداتەوە پۆزێکی دیپلۆماتانەی گرتبوو، یەکە یەکە وەڵامی پرسیارەکانی دەداوە. وەک‌ئەوە کە پێم بڵێن نۆبەی منە پرسیارم کرد:

ـ ئاغا ناوی ئەو سەگە چیە ؟

کورە چاوێکی لێکردم‌وگوتی :

ـ ناویا مەبەستت ڕەگەزیەتی ؟

**پاشماوەی رەخنە .....**

لێدەهات . تەنانەت زەمان
راوەستابوو ، ژیان چوارچێوە-
یەکی تەنگ وبچووکی بوو کە
گیانی قارەمانەکانی بە
توندی دەکوشی. لە دنیای ئەو
چیرۆکەدا چارەنووسی هەرکەس
وەک داغێک بەنێوچاوانیەوە
نراوە . ئیتر جێی هیچ چەشنە
گۆڕین وجووڵانەوەیەک نەماوە .
بەکورتی بڵێم تابڵۆیەکی
یەکجار بەخۆف وسام وبەترس
بوو سەرەڕای ئەو
مەبەستانە ناتوانین لە
شارەزایی ونوانای زانستی
نووسەر سەبارەت بە
هەڵبژاردنی وشە ورستەی جوان
( وەدەکارهێنانی ئەوان بەرێ و
جێ) چاوپۆشی بکەین .

چەند جوان وبەجێ دەبوو
کە ئەو روالەتە جوانە
خاوەنی بیرێکی نوێ ومانایەکی
قووڵ بایە !

---

←

بۆئەوە کە پرسیارەکەم بێ
وەلام نەمێنێتەوە دەسبەجێ
گوتم :

– بەڵێ،بەڵێ مەبەستم
نەژاد ورەگەزیەتی .

چاوێکی رەزامەندی لە
چوارپێیەکە کرد وگوتی :

– ئەوە لە نەژادی
" کاشمیلا"یە .

وشەیەکی سەیری بەسەر زاردا ،
هات . زانیم کە دەبێ
ئینگلیسی وشتی وابێ ، بەلام
باشی تێ نەگەیشتم و بۆ خۆم
"کاشمیلا"م ساغ کردەوە .

قاسم بێ دەنگ لەپەنام
راوەستابوو ، گوتم :

– تۆش پرسیارێکی لێ بکە .

– بڵێم چی ؟

– هەرچی بێ ، مەسەلەن
بزانە بە چەندی کڕیوە ؟

مەبەستم ئەوە بوو هەرچۆنێک
بێ ، "قاسم" بۆماوەیەکیش
کە بووە لە گێژاوی بیری ماڵ
ومنداڵ ومەسکەن وخانوو
بێتە دەر. ئیستێک پێ چوو
متەقی لێ نەهات.ویستم پێی
بڵێمەوە ، دیتم هەنگاوێک
چووە پێش، رووی لە کوڕە کرد
و گوتی :

– ئاغا ببوورن،ئەو سەگە
مەسکەنی هەیە ؟!

کوڕە لەوپەڕی سەرسوڕماندا
چاوێکی لە "قاسم" کردوگوتی:

– بە ....ڵێ ئاغا ئیختیا-
رت هەیە ،مەگەر دەکرێ بێ
جێگا ورێگابێ ، کاشمیلا گیانی
من، دیوی تایبەتی خەوتن،نان
وئاو خواردن، حەمامودەسشۆری
بە جوێیە .

پێم وابوو قاسم تازە
کەوتۆتە سەرباری قسە و
سەرنجی هەموان بۆ لای خۆی
رادەکێشێ ، کەچی دیتم هەست
وخوستی لێ بڕا . لاوەکەش
رووی لێ وەرگێڕا و لەگەڵ
یەکی تر دەستی کرد بە قسە
کردن . ویستم "قاسم" دنە
بدەم پرسیارێکی دیکەش بکا ،
بەلام کەلێی چوومە پێش نوتقم
بڕا . چاوەکانی دەرپەڕیبوون
وەک ئەوە کە دیمەنێکی
چاوەڕوان نەکراوی دیتبێ
زاری داپچڕابوو ، زۆر بە
پارێزەوە هەنگاوێک لەسەگەکە
نزیک بووە ، هێند سەیری چاو
لێدەکرد ،دەتگوت بە چاو
دەیکرێ .جار، جارەش بەسەر
سوڕمانەوە چاوێکی بە تەشک و
داوێنی خوێدا دەگێڕا .چوار-
پێ یەکەش کە دیتی " قاسم"
لێی نزیک بۆتەوە ، هەستا
لەسەر چواردەست و پاشوان
چەقی . کلکی هاویشتە سەر
نەرەی پشت وبەفیزەوە چاوی
لە "قاسم" بڕی. چوومە بن
گوێی "قاسم"وگوتم :

– نەڕۆین ؟

رووی وەرگێڕا و گوتی :

– لێرە یان لەو شارە ؟!

دەستم لە قۆڵی کرد و بەڕوو
خۆشی گوتم :

– "جارێ بالێرە بڕۆین ،
بۆئەوەی دیکەش بیردەکەینەوە

ئیدی هیچم نەدەویست .

ـ ... دەزانی چۆنە : هەر باشە ،خراپ نیە ، دوو وەتاغی هەیە لەگەڵ دەسشۆری و ئاشپەزخانە بۆخۆت ئەوەدیوتە ئیدی . کە دیتی بێ دەنگم گوتی :

ـ یا نا ، تۆ ئەو رۆژە نەهاتی ژوورەکەی ببینی ، وابوو ؟!

سەرێکم بۆلەقاند ، درێژەی بە قسەکانی دا :

ـ تەنیا تەلەفۆنی کەمە ئەویش کە سێحەبماڵەکەم هەیەتی ،ئەوجار ئەویش نەبێ بیست هەنگاو ئەولاتر لەسەری کۆڵان تەلەفۆنی گشتی هەیە و بە دوو قڕان تەلەفۆنی خۆت دەکەی. ئەوخانوویە حوسنێکی دیکەشی هەیە ، ئەویش ئەوەیە کە ، لە ئیدارەکەم نزیکە و هەتا بڵێی سەر راستە وهاتوو چۆی خۆشە ."

پاش پشوودانێک دیسان کەوتەوە سەرباسی خانووبەرە وجێگا ورێگا و گلەیی لە فلانە خزم وفیسارە دۆستکە قەولی خانوویان داوەتێ و پەشیمان بوونەوە و منیشکە دەیان جارم گوێ لەومەتڵەبانە ببوو بۆ ئەوەی ئاڵ وگۆڕێکم لە قسەکانیدا پێک هێنابێ پرسیم :

ـ ئەرێ خانۆەکەی دیکە چی لێهاتەوە ؟!

ـ کێ ها ... ؟

ـ ئەو ئاپارتمانەی کابرا هاوشاریەکەت قەرار بوو بتداتێ ، وابزانم ...

نەیهێشت قسەکەم تەواو کەم و زۆر بەتوورەیی گوتی :

ـ جابڵێم چی لێهاتەوە !

ئەو هیچ وپووچە مانگێک بوو قەولی دابوو خانووەکەیم بداتێ ! مانگێ بەپێنج هەزار تمەن، هەڵبەت بێ وەدیعە و پێشەکی ، کە هەرئەومەسەلەش بوو بەهۆی ئەوە خۆی لێ خۆش بکەم ، چونکە خانووی دیکە بێجگە لە پێنج هەزارتمەنەکە لانی کەم دووسەدهەزار تمەن پێشەکی دەستێنن ، سەبرت نەیەشێنم پێم گوت :

" کوڕە فلانی ئەمن بەو قەولەی تۆ خاترجەم دەبم و بەدووی خانووی دیکەدا ناگەڕێم . ئەویش کوتی :

" خاترجەم بە ، مەگەر لە تۆ باشترم دەس دەکەوێ ؟ .

بەڵێ ، منیش خەبەرم بەخێزانم دا کە خانووم پەیدا کردووەو خودا یار بێ ئەو رۆژانە دەیگوێزینەوە . هەر ئەوڕۆ ، ئەوڕۆم دەکرد کەرۆژی قەرار بگا وقسەمان بە یەکجاری ببڕینەوە و قەولنامە ئیمزا بکەین . رۆژێکی مابوو بۆ رۆژی قەرار کە ئەوهاوشاریە بەزیادنەبوویەم تەلەفۆنی لێکردم،وا دەکا :

" فلانی زۆر دەبەخشی خۆشکم کە ئێستا لەوخانووەدایە وقەرار بوو بڕوا پەشیمان بۆتەوە . کورت و کرمانجی گوتی :

"ناتدەمێ . نەمدەزانی بڵێم چی ،پێموایە لەوکاتەدا دەستم پێی راگەیشتبا هەر دەمخنکاند ، زۆری وە پاش دام ماڵتە ، مانگێکە هەر بەزار خۆشە ،بەراستی نامەردی کرد ،

# فەقرەقا

لە بیست کیلۆمیتری شاری، مەهاباد بەرەوجادەی میاندواو لە دەشتی شارویران ، پەنا ئاوایی "ئیگریقاش" یا "ئیندرقاش" لە بەشی بەردینی کێویکا هۆدەیەک هەلکەندراوە کە "فەقرەقا"ی ناوە.

ئەو کێوە تاک وتەنیا لە چەقی دەشتی شارویران دا هەلکەوتووە و بەسەر تەواوی لەسەر کێوەکە وردەسوالە- تی وقەبری کۆن وپاشماوەی بەرچنی دیواری قەدیم و شوورەی دێرین دەبینرێ کە بە وانە دەردەکەوێ فەقرەقا لە سەردەمی خۆیدا گرینگ ترین کۆمەلگا وقایمترین قەلای ناوچە بووە.

**دیاردەکانی فەقرەقا**

ئەو شوێنەوارە لەئامێزی دەورانپشتی خۆیدا دەڕوانێ. بەشی باشووری ئەم کێوە بەردینە، بەلێژایی یەکیتوند بۆلای زەوی داکشاوەوسێ لای تری کێوەکە بە لێژایی یەکی کەم وردە،وردە لە زەوی نزیک بۆتەوە.

بەشی بەردینی کێوەکەروو بە مەهاباد، ڕێک وساف کراوە وئەو هۆدەیەی لێ داتاشراوە، کە باشترین شوێنەواری میعماری سەردەمی "ماد"ەکانە. کێودا یە ودەستپێ ڕاگەیشتنی هاسان نیە.

عەرزی هۆدەکە تەختنیە ولای ژووروونزیکەی ٢٠ سانت بلندترە.

بە تێگرایی چوارکۆلەکەی تێدایە،کە دوانیان کەوتوونە دیوی ژوورێ ودوانیتری لە پێشەوەن ولە دەرێرا دیارن. کۆلەکەکان خڕن ودەوریان ١٧٦،وبەرزاییان ٢٢٠ سانتی میترە.ستوونەکان لەسەر و خوارەوە بە هۆی سەرستوون وژێر ستوون بە میچ وعەرزەوە لکاون و هەموو یەکپارچەن.

لە بەشی ژووری تەختی هۆدەکە کە ٢٠ سانت بلندترە، سێ قەبر داتاشراون. یەک لە لای چەپکە گەورەیە،ودوانی تر لە لای ڕاستکە یەک ئەندازەن. ولە قەبری لای ڕاست چووکترن. قەبرە گەورەکە درێژایی ٢٥٠،پانایی ١٢٥ وقوولایی ٧٩ سانتی میترە وکەوتۆتە لای باکووری ڕۆژئاوای هۆدەکە.

دووقەبرەکانیتر هەر لە ڕێکی قەبرەگەورەکەدان یەکیان کەوتۆتە نێوەراست وئەوی تریان لە لای دەستی ڕاستە.ئەوانیش هەریەکە درێژاییان ١٢٥،پانایان ٨٢ وقولایی یەکەشیان ٧٩ سانتی میترە.

هەرسێ قەبرلە لای سەرەوە ١٣ سانت گەورەتر داتاشراون. وا دیارە جێگای بەردی سەر گۆڕبووبێ کەبەردەکان ئێستا نەماون. ئەو بەردانەبێ شک نووسراوەیان لە سەربووە و ئەگەر مابان هەموو شتێکیان لەو بارەوە ڕوون دەکردەوە و بۆگۆشەیەکیتر لە مێژووی ئەو سەردەم بە کەلک دەبوون. بەلام بە داخەوەئاشکرانیە کە بۆچ شوێنێک گواستراونەوە

دیوارەکانی نیوهۆدە ساف وڕێکن ورووی هۆدەکە بەرە و باشوورەولە گەرما وتیشکی

خۆربە باشی کەلک وەردەگرێ .
بە درێژایی پتر لە دووهەزارساڵ ئاوی بەفـرو باران ڕێگەی خۆی کردۆتەوەو بە درزو قەڵشتی بەردەکاندا دێ ولەنێو قەبرەکاندا کۆ دەبێتەوە .بەوجۆرە بەهاران قەبری سێهەم تاسەر لێوان و قەبریدووهەمیشتا نیوەی پڕدەبێ لە ئاو وبەم هۆیە

سواوە .سەبارەت بەم وێنەیە هەندێک لە باستانشناسان رایان وایەکە ئێوە لە سەردەمی خۆیدا هەماری چەک و کەرەسەی جەنگی بووە .
ئەو هۆدەیە چەندین جار لە لایەن سەیاحانی دەرەوە، وەکی "راولینسۆن"،"هـۆم"، "دمۆرگان"، "ئورل ئۆستین" و هەروەها"هرتسفلد" چاوی لێ

شوێنەوارەکانی نەتەوایەتی ئێوان،لە ژێرژمارەی ۲۸۸، تۆمار کراوە .
"فەخراگاە"،"فرەگاە"، "فرەئاگرە"و"فەقرەگا"شیان پێ گوتووە .

### سەرچاوە

بەشی زۆری ئەم وتارە لە "نەشریەی فەرهەنگ وهونەری مەهاباد" نووسراوی "ناسر

زۆر کەس تاکوو ئێستا تووشی هەڵەبوون وقەبرەکانیان بە حەوز زانیوە .
لەسەر دیواری بن هۆدەکە وێنەی "تیر"ێک هەڵکەندراوە کە باوباران وتێپەڕینی زەمان وردە ،وردە هەڵیانپەڕ- تاوتووە وچەند بەشێکی

کراوە .
"هرتسفلد" رای وایەکە فەقرەقا قسنی یەکێک لە شازادەکانی "مادی" ولاتی "مانایی"یەو مێژووی ئەو دەباتەوە نێوان ۸۴۰ هەتا ۶۶۰ ی پێش زایینی.(۱)
فەقرەقا لە ڕێزی

فەرنوودوەرگێڕاوەتەوە سەر کوردی .
تەرح ووێنەوهەندێک زیادی هی وەرگێڕە .

۱- بە رایەکی تر ۷۰۸ هەتا ۵۵۰ پێش زایین .

# ئێمە و خوێنەر

سنە ـ **ئیبراهیم فەلاحی :**

برای بەڕێز دژایەتی بووک وخەسوو ئەفسانەیەکی مەشهوورە وئەمشەڕەدندووکە نەک هەر لەنێو نەتەوەی کورد بەڵکوو لەنێو هەموو گەلێکی دنیادا بووە و ئێستاش نەبڕاوەتەوە. بەلای ئێمەوە ئەم ناکۆکی یە هۆی ڕەوانی و ئابووری وکۆمەلایەتی هەیە . لەباری ڕەوانی یەوە : دایک وادەزانی ژنێکی لاوەکی کوڕەکەی فڕاندووە وخۆی کەلکی لێ وەردەگرێ ! لەباری ئابووری یەوە : هێزیکی کار لەدەستچووە و بۆتە بنەمایەکی سەربەخۆ وچی دیکە بەرهەمی کارەکەی نادا بە دایک وباوک . لە باری کۆمەلایەتیشەوە : بەداخەوە هەمیشە کوڕیان پێ لە کچ هێژاترە . خەسوو پێی وایە بووکەکەی لەشانی زاوادا نیە وکوڕەکەی حەسار بووە ! ئەڵبەتە لەپێکی بەرزبوونەـ وەی پلەی فەرهەنگ وتێگەیشتن ئەمجۆرە بیروباوەڕەش لەکزی دەدا ولەنێو دەچێ. بەلام ئەمەش بزانە کە هەمیشە خەتای خەسوو نیە! جاری وایە بووکیش بەئاکاری نالەبار و خۆپی زلی وپرتەوبۆڵە و ڕانەگرتنی ئیحترامی خەزوورو خەسوو وکەس وکاری دیکە خۆ لەبەرچاوان دەخا . بەم جۆرە ئاگری قڕەوهەرا و ناتەبایی هەڵدایسێ . ئەمەش بلێین کە هەموو ناکۆکی یەک دوو لایەنی هەیە . جاری وایە هەردووک لایەن خەتابارن.

واش هەیە ڕێ وشوێنی ژیانی دوو بنەماڵە لێک جیاواز بن وبووک نەتوانێ بەسانایی خۆلەگەڵ بنەماڵەی تازە ڕێک بخا ولەبەر ئەمە ناتەبایی ساز بێ .

سەقز ـ **جەلال کەریمی :**

بە پێی لێکۆڵینەوەی زانایانی زمان ناس زوربەی زمانەکانی دونیا لەسەرەتادا یەک بوون و پاشان بەلێک هەڵبڕانی کۆمەڵەکان وپسانی پێوەندی و ژیانی هاوبەشیان وردە وردە جیاوازی زمان پەرە دەگرێ و زمانە جۆرا و جۆرەکان پەیدا دەبن .

مەهاباد ـ **س . ب . هیوا :**

پێشنیارەکانت لە گۆواری سروەدا بەرچاو دەگرین . لە کۆنگرەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردیدا ئەوان پەسند کراون. چارەنووسی ڕێنووسی کوردیش هەر لەم کۆنگرە دابین کرا .

بۆکان ـ **مەلەک ئەبووبکری:**

پرسیارت کردووە فەرقی **سەلمان و سولەیمان** چیە . **سەلمان** لە سولەیمان گەورەترە وەک **حەسەن وحوسێن** .**حەسەن** گەورەیە **وحوسێن** لە **حەسەن** چکۆلەترە .

سەرچۆمی سەردەشت ـ **محەممەد مەزلوومی :**

هۆی ئازادنەبوونی زمانی کوردی ئەوە بووە کە گەلی کورد تا ئێستا لە ژێرباری ستەمدا بووە و ڕژێمەکۆنەـ پەرستەکانی پاشایەتی نەیان هێشتووە فەرهەنگ و زمانی کورد گەشە بکا . لە سایەی کۆماری ئیسلامی یەوە ئێستە نووسین و خوێندنەوەی کوردی ئازادە و هیوادارین ڕۆژێک بێ کە لە مەدرەسەکانیشدا کوردی بەدەرس بخوێندرێ .

ئێمەش بۆ **حەسەن زیرەک** ڕێز دادەنێین و هیوادارین لە ژمارەکانی داهاتوودا بتوانین باسی بکەین .

ئێمەش دژی داب و شوێنی ناحەزی کۆمەلایەتین .

**شیربایی** وەرگرتنیش یەکێکە لەوان. هیوادارین وردە وردە لەنێو بچێ. ئەوەش بزانە تا ڕۆژێک پلەی زانست وفەرهەنگی کۆمەڵ بەرز نەبێتەوە داب و شوێنی ناحەزی ئێستا (کە ڕەنگە لە ڕابردوودا جوان و پێویست بووبن) لەنێو ناچن.

سەقز ـ **حەیدەر زەمان:**

هەر وەک زۆر جار ڕامان گەیاندووە تەنیا شەرتی فێر بوونی زمانی کوردی موتالای زۆرە. هیوادارین **"سروە"**ش لەم ڕێبازەدا بتوانێ بە کەلک بێ و یارمەتیتان بدا.

مەهاباد ـ **حوسێن ئیستوار:**

پاش مامۆستاهێمن شاگردەکانی ئەو ڕێگاکەی درێژە پێدەدەن. مامۆستاهەژاریش یارمەتیمان دەداو ڕێنوێنیمان دەکا.

وڵاتی تورکیەش مسوڵمانە. زوربەی خەڵکی ئەوێ سوننی مەزەبن. زمانی تورکی و کوردی و عەرەبی وئەرمەنی گرینگترین زمانی ئەو وڵاتەن.

شنۆ ـ **مستەفا ڕەسووڵی ئازەر:**

ئەم باسەی بۆت ناردووین زۆری بەبەرەوە. ئەگەر دەتوانی ئەم بابەتانە یەک یەکشی بکەوە و بۆمان بنێرە تا ئەگەر دەستەی نووسەران ڕای لەسەر دابە نۆرە چاپی بکەین.

بێورانی سەردەشت: **هیوا بێورەیی:**

پرسیارەکەت گەلێک جوانە و دەتوانێ ببێتە هەوێنی وتارێکی دوور و درێژ.

پێشەکی بابزانین ڕۆشنبیری و پێشکەوتن بەچی دەڵێین. ئێمە دەتوانین ــ خوێندەوار و سنعەتکار وزانا وپێشکەوتوو بین و لە هەمانکاتیشدا هەر کورد بمێنینەوە.

بەلای ئێمەوە پێشکەوتنی هیچ گەلێک بەمانای ئەوە نیە خۆی بە بیانووی پێشکەوتنەوە لە شارستانیەتی گەلێکی دیکەدا بتوێنێتەوە؛ پێشکەوتن لە لای ئێمە بەو مانایە کە گەل و کۆمەڵ چۆنەتی ژیان وپلەی تێگەیشتن ورادەی بەختەوەری خۆی لەچوارچێوەی ئەو نیهاد ودیاردانەی (دین و مەزهەب وداب وشوێن) کە بە هەزاران ساڵ ریشەیان داکوتاوە بەرێتە سەر.

نامە و دیاری ئەم ئازیزانەشمان پێ گەیشتووە، سپاسیان دەکەین.

کۆسەکەرێزی مەهاباد: **نازم حیکمەت:**

بۆکان: **ئەحمەد مەولانی.**

ڕەحیمخانی بۆکان: **خالّند ئەحمەدی ـ مەهدی قادری.**

سنە: **میرزا هەورامی.**

شنۆ: **ئەحمەد ڕەحمانی زادە.**

سەردەشت: **سەعید خزری عوسمان خزرپەنا.**

بەیرەم: **ڕەحمان مەحموودی.**

کاژێی سەردەشت: **سەعید ڕەحمانی.**

سنە: **تۆفیق مەحموودی.**

بۆکان: **ئیسماعیل قاسمی.**

تەپەڕەشی میاندواو: **ئەسعەد بێکەسی.**

کۆنەخانێ: **ڕەحمان ئەنبیا.**

سەقز: **ئامینە عەزیزی.**

سەقز: **ڕێبوار.**

فەککە: **کەماڵ بەهرامی.**

مەهاباد: **سمکۆ ئەیبووبیان.**

سنە: **محەممەدرزگارسراجەدینی**

سەردەشت: **ساڵح قوربانیپوور**

بانە: **عومەر مەولوودی.**

سنە: **هومایوون ئەحمەدی**

مەهاباد: **محەممەد مەحموودی.**

نەغەدە: **سەیدجەماڵ شوکری.**

پیرانشار: **ڕەحمان حوسێنی.**

گەرگوول: **ڕئووف عومەری.**

سەردەشت: **عەبدوڵڵا ئیلاهی.**

پیرانشار: **قادر کولکەزێڕینە**

ئالان: **هەژار.**

ـ دەباشە ئیدی ئەو نووکە نووکەت لەچیە ؟

ـ کوڕە جاچۆن ناگریم . وا دەگریم هەتا چاوم دێتەدەر ! جا تۆخودا ئەوەش بوو بەحاڵ؟ ئەوەش ژیانە ؟

ـ کچێ ئاخر بۆ پێت وایە ئەمن هیچ نازانم بەسەری قادری لەتۆ پتر ناڕەحەتم . خودام بەگژ ئەوە داکرد وای هەشسەت تمەن دێنینەوە . مام سەلیم بۆخوا گرتووتی وەرە شاری تازە ئەو زەوی وزارە بۆ چی دەبێ. ئەگەر راستیت دەوێ ئاوی نەماوە نا ؟ ئەوەتا بزانە زەوی تۆ نان و تۆویش ناکا . وەرە شاری ."

ئەم گفتەخۆشە چەند جار و بە چەند شێوە لە لایەن دۆست و ناسیاوانەوە دووپات کراوە

کەریم قەیوومی

بەسەر ئێمە هێنا .

کێ وای بەسەر هێنابوو؟ چ قەومابوو؟ بۆ دەگریان ؟ باب زۆرباش دەیزانی . ناحەق نەبوون قوڕ وەسەر بکەن بەڵام بۆخۆی بەوخوی کردبوو کەس هیچی پێ نەدەکرا .

چەندساڵ لەمەوبەر ئەگەر جاروبار بە هەڵکەوت رێی لە شار کەوتبا ، تێرایی حەوتوویەکی خزمەکانی رۆن و لۆرک ونان پێ دەبوو. دوو سێ یەک لە گوندی ئەوان هاتبوونە شار ووەزعیان باش بوو . مامرۆستەم هەموو جارێ هەر کە قسە لە قسە دەکەوت دەیگوت "برا ئەمن سێ کوڕم هەیە! "ئەوی گەورەم فەعلەیە ئەوی نێونجیم بەخۆو بە ژنی لە کوورەن،کوڕی هەرەچکۆلەشم شاگرد کەبابچی یە . خێزانم نانی ماڵان دەکا و بۆخۆشم بەسەر پێوە رۆژێ دووسەت تمەنی دێنمەوە .جگەرەوتەسحێب وشتی وا دەفرۆشم . بابم لە شاری پووڵ هەڵڕژاوە ! پیاوی دەوێ کۆی بکاتەوە .ئێمە چمان پێ ناکرێ رۆژی لانی کەم خوا دەزانێ بەڵام هەرچی بێ مام سەلیمی هەڵخەڵەتاند .

سێ چوار سەر رەشەوڵاغی بوو لە ئاوی کرد و زەوی یەکەی دا! بە ئیجارە وباغەکەشی فرۆشت دووسەت هەزار تمەنی پووڵی نەغد لە تەنگەی گیرفان نا و بەرەوشار پالاوتی .

بەقەراری خۆی دەبا رۆژێ بە خۆو بەکوڕانی هەزارتمەن پەیدا بکەن ئەو پووڵەش بەشی هەموو شتی دەکرد .

خێزانی مامسەلیم وەک مەڕی گێژ بەدوویدا رێچکەیان.

بەست و هاتنە شار. بەر لە هەموو شت روویان لە ماڵی مام رۆستەم کرد و لەوێ مانەوە.

مامسەلیم کاری بوو بەوە کە بە دووی خانوودا بگەڕێ. بە خەیاڵی خۆی کۆشک وتەلاری بە دووسەت هەزار تمەن دەدەنێ بەڵام پاش ماندووبوونێکی زۆر لێیڕا ئارەزووی قەڵاوباڵەخانە چاڵ بکا. ئیدی ئەوجار بە هەموو شت رازی بوو. رۆژێک لە بونگایەک وەژوور کەوت وداوای خانووی کرد. لەپێشدا لێیان پرسی چەندی پووڵ هەیە؟ هەر کە گوتی دووسەت ... .گوتیان تۆ تەنیا چارەت ئەوەیە خاک بکڕی وبۆخۆت سازی بکەی. ئەو قسەی زۆر بەدڵ بوو چون خانوو سازکردن زۆر بەلایەوە هاسان بوو. پار دوو وەتاغی ساز کردبوو بەڵام هێندەی تێنەچوو بوو. دوو تەراکتۆریان بەرد بۆ هێنابوو. هەزار بلووکی کڕیبوو. قوڕ بە خۆڕایی بوو کا زۆر وزەوەند بوو. داریشی لە پۆلەچناری قەراغ باغەکەی خۆی بڕی وبرازاکەی و قادری دراوسێی هاتنەیاری و وەستا کەریم خانووی بۆدانا. ئەمجا-رەش بەم خەیاڵە خاکی کڕی بەڵام لەکوێ لە "مێشاوا"

مێشاوا بەشێکی دوورەشار بوو. بەڵام کابرای بونگا گوتبووی "خەمی ئەوەت نەبێ ماشین دێتە بەردەرگا. ئەوە ئاوو بەرقیشی بۆ دەکێشن. بەسەری تۆ دوو ساڵی تێوەرنا سووڕێتەوە گەزی تمەنی تمەنێکی دێتە سەر. قەباڵەشت تا ئەودەم دەدەنێ"

ئەوانە مامسەلیمیان فریو دا. خاکی کڕی وپووڵ نیوەبوو هەروا لەفکر دابوو نەیدەزانی چ بکا. لەبەرخۆیەوە دەیگوت

- کوڕە دەغیلت بم لێرە خۆڵیش بە پووڵە. داروبەردیش بەخۆڕایی نادەن. ئەوەندە پووڵە بەشی چ دەکا.

هەرچۆنێک بوو دوو چاوە خانووی لە بەرقەدی کێو ساز کرد وبنەی ڕاگوێست. دڵی بەوە خۆش بوو کە شەو سەرێنی خاترجەمی لەژێر سەر دەنێ. تازە لە خەم رەستووە بۆتە شارەیی!!

خێزان ورد و درشت لەخۆشی ئەوە کە ماڵی تازەیان هاتۆتە شار تلی تلیان بوو. نە ئاو هێنانیان لەبەر گران بوو، نە لەبەر بێ بەرقی ناڕەحەت بوون. بەڵام چەند رۆژ پاشان ئەو ئاورە دامرکا و پشوویان هاتەوە بەر. تازە مامسەلیم بەوەی زانیبوو کە کڵاوی چۆتە سەر.

خانوویەکی ساز کردبوو، حەسارەکەی دیواری نەبوو. بۆ خۆشی نەیدەزانی بە دەستی بەتاڵ چ دەتوانێ بکا. هەرچی هەیبوو لەم دووچاوە خانووەی خەرج کردبوو بەڵام خانووەکە هەژدیها وابوو هەرچی لەزاری کوشیبا هەڵیدەلووشی و بە لایەکی ڕانەدەگەیشت.

تازە ئەگەر پووڵیشی بە دەستەوە باسەری لەڕاووڕووتی بازار دەرنەدەچووکەڵەشێریان بە گیسکە نێر دەمل دەپەستا-وت.

ئێوارەیەک تازە تاو پەڕیبوو." شەوکەت" خێزانی مامسەلیم نێوچاوانی تێک نابوو. کەیفی جارانی نەمابوو دڵی بۆ چۆرە شیری مانگاسوور دەیکورکاند. هەناوی خۆی و منداڵی لەتاو سپیایی سپی ببۆوە. عەلادینێکی بۆ کڕابوو نە تینی هەبوو نەشۆق. کووپە پەنیری ئاخندراوی لەبەر دەست نەبوو. سێ کوچکەی حەوشی گوندی بۆساز نەدەبوو. ئەگەر سازیش بوو باوە ئاوردووی نەبوو. رۆژی سێ چوار سەعات لە نۆرەی نان ڕادەوەستا. ئێواران وەک قەدیم دەبا چووبا بۆ ئاو. لە گوندیش بەرقی نەبوو لە شاریش بەرق نەبوو. هەروا بەبێ وازی سەری چەلەنگە نەوتەکەی دا. نەوت نەمابوو. هاتەوە ژوور. کوڵی گریانی لە ئەوک مابوو. رووی لە مامسەلیم کرد وگوتی:

- پیاوەکە نەوتمان نەماوە؟

- پەکوو ماڵت خرابێ شار. وەڵڵا دەڵێی حەزیایە. دەجا بڵێم چی نەماوە لە کوێ هەڵێنجم؟

- ئاخر باشە ئەدی ئەگەر واتدەزانی بۆ ئێمەت گردەنشین ودەستەوەستان کرد؟

- کوڕەچ بکەم؟بۆگردەنشینی

ئەوەنیە هاتوویە شار ؟

ـ هەی خودا مەبارەکی نەکا چ شارێکە.جا تۆخودا ئەوەش ، بوو بە شار ؟

ـ چیەتی ؟ ئافرەت چیەتی؟ خودا لێی گۆڕیوی ؟

شەوکەت لێوەسیسەکانی هەڵقرچا . چاوە پرووشەکانی پڕبوو لەئاو . دەستی کرد بە گریان .پاش ماوەیەک گوتی :

ـ ئەمن نازانم ئەوە چ هاتنەشارێکە؟ باشە فەڕقی شار ومالەبەقوڕ گیراوەکەی خۆمان چیە ؟

لێرەش هەر لەبەر شۆقی گرسۆز نی ؟ لێرەش هەر نابێ بۆ ئاو بەبەندەنێ هەڵگەڕێی؟ جا ئەگەر هەروابوو ئەو مالە کاولەی خۆمان چی بوو ؟ئەویش وەک شاری تۆ خەتی هەبوو . مینی بووس دەهاتە بەردەرکەو سواری دەکردی وەک ئێرە . کوا شار ،کوا ئاوەدانی ،کوا پوول؟ کوا بەڕق ...کوا ... نە

نەیتوانی درێژەبەقسەکانی بدا . لە قولپەی گریانی داوە دەگریا ودەلالاوە .بەمانگا سوور وبەروتەندوور ونان وهەویری ونێرەی هەڵدەگوت . تاریک داهاتبوو بەلام شەوکەت هەر دەگریا ! بۆخۆی بۆبەرەمەشکەو کەندووە ئاردی ! بۆ سێ کوچکەی حەوشی !بۆدراوێی بە رەحم و بەدڵ ودەروونی .

مامسەلیم دەستی لە ئەژنۆ وەراندبوو . ئەوەندەی جگەرە کێشابوو خینەی لە سینەی دەهات . لێوی رەشی ددانە زەردە خوراوەکانی شاردبۆوە ، هەر سەری ڕادەوەشاندوسەیری شەوکەتی دەکرد . نەیدەزانی چ بکا ؟ زگی بە خۆو شەوکەت دەسووتا .ویستی دلخۆشی بداتەوە گوتی :

ـ دەباشە ئیدی لێی ببڕەوە ئەو نووکە نووکەت لە چیە ؟

ـ کوڕە جاچۆن ناگریم . وا دەگریم هەتا چاوم دیتەدەر جاتۆخودا ئەوەش بوو بە حالّ؟ بە ئاخری سەری تووشی پەت پەتێن و سوالّت کردم ! قەت ئەوەش گوزەرانە . مالّت لەدێی خۆشترە؟ ناوەڵلا ، تێروپڕتری ؟ ناوەڵلا. ئاخر بلێ نانتنەبوو ئاوت نەبوو؟ هاتنە شارت لە چ بوو ؟

ـ بەسە! خودامهێنایە تکاتە ئافرەت بەسە . دەست هەڵگرە دەردی خۆم کەمە نۆرەی تۆیە؟

ـ خەتای کێ یە؟ بۆخۆت کردووتە ! کوڕە ئەوانەش خاتری تۆ . ئەدی چۆن بژین ؟ ئاخر کارێک ؟ کاسپی یەک ؟

ـ ئافرەت بۆ ئەتۆ پێت وایە ئەمن هیچ نازانم ، بە سەری قادری لە تۆ پتر ناڕەحەتم . خودام بەگژئەوەدا کرد وای بەسەر ئێمە هێنا .

ـ دوعا لەکەس مەکە . کەس شیروتیری پێ نەبوو .

ـ با ...با لە شیر وتیر خراپتریان پێ بوو . لێمگەڕێ با بە دەردی خۆمدا بکەوم . کاریش دەبینمەوە خوداکەریمە

ـ راستە خوداکەریمە بەلام بۆ کەسی لەکولانە نەکردووە .

ـ بۆ خۆم بە خۆم کرد سەنگبارانم کەن !.... ئافرەت کارم دیتۆتەوە .

ـ چ کارێک ؟

ـ کار ...کارە ئیدی. ئەوە هەباسە سوور لەباغی میرزا قاسمی دەڕواو دەچێتە کووردی دەچمە جێگای ئەو .

ـ وەڵلا باشە! . ئاخر کابرا ئەتۆ نەتگوت دەچمە شاری چیدیم پێمەرەداری پێناکرێ ؟ ئەگەر هەر دەتزانی باغەوانی دەکەی بۆ باغی خۆت ڕەعەمەل نەدێنا ؟

ـ ئەدی خانم وخاتوون دریشووکەت دەرکێشاوە دەفەرمووی چ بکەم ؟ ها ... ڕاوەستە هەتا هەموومان لە برسان دەمرین ؟

ـ نا ...چ لەسبەی زووتر نیە .... پیاوی چابە با بڕۆینەوە .

ـ چی ؟ بڕۆینەوە ؟! .

# لافاو

هاودەردی سێڵاولێدراوی وڵاتەکەم

لافاو کە بەخوڕ دێت و بە هەیبەت دەگوڕێنێ
راز و رەوەز و ماە و چڕ و زەرد دەڕمێنێ

دار و دەوەن و جالە هەموو هاتنە زالە
شێت و دڕە دەستی لە هەموو شت دەوەشێنێ

دۆڵ و خڕ و هەڵدێر و تەلان و گەوە و پێچ
سینگیان وەکوو زۆنگ کون کونە ئاوێ دەدەڵێنێ

هێلانە لەبەر هێرشی ئەو نوقمی شەتاون
تالان و بڕۆی کوێ ؟ دەیەوێ خۆ بسەپێنێ

پێ شێلی پەلاماری ئەون سوورەگوڵی هەرد
زامارە دەڵێی ماشقە کوژاوە ودەو شێنێ

رادەبرێ و رادەگرێ و هەڵدەگرێ چە وو چێو
دەرفێنێ مەڕ و میگەلی شوانی دەشەوێنێ

بەزمی گەڕە لاوژەیتی لەگەڵ هەورە تریشقە
خوڕڕەی ئەم و گوڕڕەی ئەوی دونیا دەهەژێنێ

حیلەی بەسەرئەو دەورە وەها بەرز و بەزەبرە
کەم ماوە بڵێم گوێچکەی گەردوون دەدڕێنێ

شالاوی هەموو سووچ و کەلێنێکی دەپێکێ
بەژنی گوڵ و خەڵف و چڵەگیان دەپەڕێنێ

جەرگی زەوی لەت لەت دەکرێ بەم هەڕوگیفە
فرمێسکی خەفەت بۆ هەموو لا هەڵدەوەرێنێ

رادەبرێ و ناوەستێ هەتاکوو کە دەوەستێ
ئەوکاتە پەپوو دێت ولەجێ شوێنی دەخوێنێ

ح.رەشیدی زەرزا

# رێنوێنی ئەدەبی

....

**بۆکان + سادق جەڕاحی :**

شیعرەکەتمان خوێندەوە .لە باری وزنەوە کەم و کووڕی هەیە وەک ئەم دوو بەیتە :

**ئەوڵی دەفتەر بەنامی**
**خالیقی دانا**
**سانع وپەروەردگار و حەی و**
**توانا**
**بەهاران خۆشە سەر شاخی**
**وەتەنمان**
**تەماشای سەوزو شینایی**
**وەڵاتمان**

سەرەڕای ئەوە کە وەزنی ئەم دوو بەیتە یەک نیە لەباری قافیەشەوە لەنگە " وەتەن" و "وڵات " نابنە قافیە .

ئەمجار بڕوانە ئەم شیعرە :

**لە لای سوێسنەولای هەڵاڵە**
**لەسەر شاخی وڵاتمان خۆش**
**بەحاڵە**

لەم بەیتەدا " خۆش بەحاڵە" مانای چیە ؟

هیواداریـن پتر خۆماندوو بکەی وشیعری جوانترمان بۆ بنێرێ .

**شنۆ - زورار پەیغامی :**

ئەم شیعرەی بۆت ناردووین زۆر بەناوبانگە و کەم کەس هەیە نەیزانێ. ئەمە شیعری "وەفایی"یە کە دەڵێ :

**گوڵەکەم دەڵێن ئەوا دێ**
**هەموو وەختێ چاوەچاوم**
**ئەی خودا توبڵێی وەها بێ**
**بێتەوە رووناکی چاوم ..**
**هەقە کەوەکوو وەفایی شێت**
**وشەیدا وسەحرایی**
**مەلەکان خۆیان نیشان دام**
**پەریان دەستیان لێداوم**

بەڵام تۆ دوو سێ بەیتت نێوئاخن کردووە و لەئاخریدا گوتووتە :

هەقە کە وەکوو **"زوراری"**
شێت وشەیدا و سەحرایی .....

شیعری دووەمیش "راوچیان"ی کاک سیمانە ولەسروەی ژمارە ٧دا بڵاوکراوەتەوە .چاوەڕوانی بەرهەمی خۆتین .

**سەردەشت - رەحمان واشەمزینی:**

شیعرەکانت لەباری وەزنە - وە عەیبدارن وەک ئەم دوو بەیتە :

ئەی برادەران تەماشام
بکەن کەوا دیارم
من کوشتەیی دەستی چەرخی
رۆژگارم
رۆژی قیامەت لە دەرگای
خودا
شکایەت دەکەم وەڵڵاوبیللا

لەباری قافیەشەوە کەم و کووڕیان هەیە وەک :

رۆژگار لەگەڵ من هەر وا
خراپ بوو
لەهیچ کاتێکدا وەفای بۆم
نەبوو

یا :

خۆکەسێک نیە قسەی لەگەڵ
بکەم
دەردی دڵی خۆی لەبۆ بەحس
بکەم

**پیرانشار - عومەر پالیش :**

داواکانت بەجێ بوون حەولیان بۆ دەدەین . بەڵام بەداخەوە کتێبی"گوڵاڵەکانی رۆژگار"مان نیە دەنا بۆمان دەناردی .

**سەقز- رەزا وەفادووست :**

بەداخەوە شیعرەکانی تۆش لەباری وەزن وقافیەوە کەم و کووڕیان هەیە وەک ئەم شیعرە :

وەرزی تاڵی ژینی هەژار
وەرزی دەست کورتی نەدار

سەرەرای ئەوەش " کوردان" و "زستان" نابنە قافیە ."ویران" و"بێستان" قافیە نین .

با ئەوەشت عەرز بکەین "شیعری نوێ"ش وەزنێکی تایبەتی خۆی هەیە وشیعری بێ وەزن شیعر نیە . هۆی چاپ نەبوونی دووهەم شیعریشت

ئەمە بوو.

بانە- **فاروق قادرخانزاد:**

شیعرەکانت جوانن هەستێکی جوانیان تێدا بەدی دەکرێ. ئەگەر هێندێک خۆ ماندوو بکەی دەتوانی شاعیرێکی باش بی.

پرسیارت کردبوو، کە ئەم نازناوەی من کەسی دیکە هەڵی بژاردووە؟

لە وەڵامدا دەبێ بڵێین ئەگەر کەسیش ئەم نازناوەی نەبێ دیسانیش پێویست نیە هەرکەس شیعری گوت نازناویشی هەبێ؟ ناوی خۆت هیچ عەیبی نیە و شیعرەکانیشت هەر بەناوی خۆت بڵاو بکەوە.

بۆکان - **عەلی خوسرەوی:**

پیتی "ک" و "گ" هەر کە بەر لە پیتی (ێ) یا (وی) هات راوێژەکەی دەگۆڕێ. ئەمە قاعیدەیەکی گشتی یە لە زمانی کوردیدا، بەڵام پێویستی بە پیت یا نیشانەیەکی تایبەتی نیە.

بۆکان - **ئەییووب عەباسیان:**

شیعرەکانت چون لەباری وەزن وقافیەوە کەموکووڕی یان بوو نەمانتوانی چاپی بکەین. چاوەڕوانی بەرهەمی جوانتری ئێوەی بەڕێزین.

بۆکان - **عومەر حیسامی:**

شیعرەکەت لە چەند جێگا ئیشکالی وەزن وقافیەی هەیە ولە چەند جێگەش لە باری نێوەرۆکەوە کەم و کووڕی تێدا دەبیندرێ.

کەمن باور بکەم دیسان
بەهارە
بگێڕین کۆڕی شادی گشت
رەفیقان

یانی چی؟ مەبەستت چیە؟ بەیتێک دوای ئەوەش دەڵێی:

لەهەر لایەک بەهار بێت و
بەهار بێ
مەهاباد و سنەو ناوشاری
بۆکان

هەرچی کردمان لەوەنەگەیشتین کە دەتەوێ بڵێی چی؟

هیواداریین پتر حەول بدەی ئەگەر پێت خۆشە شیعر بڵێی دەبی پێوەی ماندوو بی.

سنە- **مەحموود ئەمینی:**

نووسیوتە سروە بەزاراوەی مەهابادی یە. بەڵام ئێمە پیمان وانیە هیچ کوردێکی مەهابادی بەم رێزمانە کە سروەی پێدەنووسری قسە بکا.

هەستی شاعیریت هەیە بەڵام بە پەلەی. هێندێک موتاڵا بکە لەباری وەزنی عەروزەوە کتێب بخوێنەوە. بە هیوای خوا سەرکەوتوو دەبی. ئەم نموونەش لە شیعرەکەت چاپ دەکەین.

مانگ بێ خەیاڵە هەر دێت
و دەڕوا
مانگی من لە ناو دەردی
گەلدایە
مانگی تو لەنێو دەردی گەلدا
چ دەکا؟

شیعری ئەم ئازیزانەشمان پێ گەیشتووە بەڵام لە باری وزن و قافیەوە کەم و کووڕیان هەیە ونەمانتوانی چاپی بکەین.

سەردەشت- **عەلی عەلیزادە،**
ئەهواز- **حوسێن خاڵندی.**
نەغەدە- **غ - کاکەیی.**
پیرانشار- **مستەفا عەزیزی.**
بۆکان - **ئەسعەد نادری، سمایل وئەحمەد ئەحمەدنژاد.**
بانە- **بێزار،**
قەڵادزی - **خدر... مینە.**
سەردەشت- **محەممەد، واوی، عوسمان سوێسنی.**

تاران : **محەممەد قەهوەیی**
سەقز : **حوسێن محەممەدزادە**
شنو : **بەدیع مەحموودی**
سەقز : **نەوژین**
تیکان تەپە : **ئەحمەدمەکاری**
مەهاباد : **عەزیز ناسری**
شنو : **ئەحمەد رەحمانی**
مەهاباد : **پەشیو**
جەلدیان : **عەلی ئیسماعیل زادە**
نەغەدە : **حەسەن پەریشان**
شنو : **کەیفی برادوستی**
سەردەشت : **م - شیوەن**
شنو : **محەممەد چووکەلی**
سەردەشت : **ئیبراهیم گەلەبان**
مەهاباد : **س- عیلم ئابادی**
سەقز : **سەرخو وەرزیر**
مەهاباد : **جەعفەر رەحمانی**
مەهاباد : **ع - سیامەند**
**سەقز** : هەژار بانەای
**بانە** : خالی شاوەیسی
**شنو** : محەممەد حوسین پوور
**خانی** : لاوین
**خانی** : عەلی سمایل زادە
**شنو** : ئەبووبەکری شاداب
**مەهاباد**: ئەحمەد مەحموودی

کۆت وشەڵوارەکۆنەکەی من نەک هەر دەقیان چوو بوو ، رەنگ ورووشی چیە پێیاوە نەمابوو. وایان لێهاتبوو دەروجیران وخەڵکی گەڕەک کەس نەبوو نەیانناسێ . تەنانەت جلک شۆری سەر شەقامەکە ئیتر بۆ شوشتن و ئوتوو کردنیان قەبزی نەدەدا. دوایەش بەوهەموو گێژی وکارە زۆرەوە کە هەیبوو دەستی دەبرد ولەجلکی موسڵمانانی هەڵدەوارد و هەر کاتێک هەتیوەقۆشمەکەم بەوێدا رۆیبا دەبن هەنگڵی دەداو بەرێی دەکردەوە .

خزموناسیاو کە لەرێگەی دوورەوە جاروبار بەسەریان دەکردمەوە ئەگەر ماڵەکەمیان بۆ نەدۆزرابا وە ناونیشانی کۆت وشەڵوارەکەمیان هەڵدەدا ومنداڵە وردکەی گەڕەک ورد و درشت وەپێشیان دەکەوتن و دەوری ماڵەکەمیان دەدا .

سەرگورشتەی پڕکارەساتی ئەم کۆت وشەڵوارە بەنرخانە لەدوازدەساڵ لەمەوبەرەوە دەست پێدەکا . لە سەرەتای سەفەرێکی دوور و درێژ و چاوەڕوان نەکراو بەهەڵکەوت لە پاتەختی وڵاتێکی هاوسێ رێگەم کەوتە فرووشگایەکی گەورە وتووشم بە تووشیان هات . هەرچاوم پێیان کەوت ونەکەوت وەک تیری ئەنگاوتە چوونە دڵمەوە . بێ سێ و دوو پارەکەم بۆخاوەن فرووشگا بژارد و لەترسی ئەوە کە نەکا پەشیمان بێتەوە بەغاردان بەرەوماڵ بوومەوە .

لەمیوانخانەکە سێ پلەکانم دەکردە یەک تا زوو بگەمەوە ژوورەکەی خۆم لە تەبەقەی یەکەم . لە ژووری وەبیرم هاتەوە کە دەبوو سڵاوێک لە مودیری هۆتێل بکەم کە لە جێگەی رۆژانی لەپشت چاویلکەکانیەوە تەماشای دەکردم . بەڵام تازە دەرچوو بوو .

جلک گۆڕین دەستی پێکرد بەڵام چۆن ؟ سەعاتێک زیاتر لەبەر ئاوێنە هاتم و چووم وراست وچەپم کرد . جار لەگەڵ جاریش پترم ئافەرین بۆ وەستاکەی دەنارد"دەک دەستت نەڕزێ وەستا بۆ جلکی دروونە" . "سەدهێندەش بارەکەڵڵا بۆئەو سەلیقە جوانەی خۆم !"

دوای ئەوە کە لە هەموو کارێک بوومەوە جارێکی دیکەش لەبەر ئاوێنە خەبەردار راوەستام کە دڵنیا بووم هەموو شتێک زۆر بەرێ وجێ یە بەنیازی گەڕان وەدەر کەوتم . ئەوجار لە داڵانەکەدا دەنگم هەڵێنا وسڵاوێکی گەرمیشم عەرزی جەنابی مودیر کرد کە

ئەویش بە بزەیەکی پڕمانـاوە سەرێکی لەقاند و دەیویست سەرم بخاتە سەر. بەڵام دەرفە- تم نەدا ولەپلەکانان ڕۆیشتمە خوار. چەند ڕۆژێک ئەم سەر ئەوسەری شەقامەکانم پێوا . نازانم چۆن ئەو لیباسانە قەڵافەت ودیمەنی منیان واگۆڕی بوو. هەستم بەوە دەکرد کە گرژی و مڕچ و مۆنی یەکەم هەتا رادەیەکی زۆر باشتر بووە. بەتایبەتی ئەگەر ڕێبوارێک "جابا بەرێکەوتیش بایە" خێسەیەکی لێدەکردم و سیلەی چاوی دەدامێ هێندەی دی کەیفم بەخۆم دەهات وئەو بڕوایە لەمندا بەهێز و بەهێزتر دەبوو کە: نەخێر، من زۆر گۆڕاوم، بەینی عەرزوعاسمان فەرقم کردووە، نەخێر نەخێر ئێستە لەکوێ جاران لەکوێ ؟

بەتایبەتی دوای ئەوە کە دۆستێکم کڕاواتێکی ڕەنگی کۆت وشەڵواڕەکەی بەدیاری بۆهێنام ئیتر مەسەلەکە لە گاڵتە بەولاوەتر چوو، کە ئەویشم گرێدا ئەوجار هیچم لە گەنجە تەرپۆشەکانی وڵاتی غەریبایەتی کەم نەبوو، هەر ئەو کڕاواتەش بوو کە دوایی کاری دا دەستم و خەڵکی هێنا مە سەیرێ!

یانی چتان لێ بشارمەوە لەو ڕۆژەوە کەئەو کراواتەم بەستبوو دوودڵی ووەسوەسەی ئەوە کە نەکا گرێی کڕاوا- تەکەم خوار بێ، بەلای ڕاستە یان چەپەدا هاتبێ، لەهەموو دەرفەتێکدا لەبەر شووشەی دووکانان رادەوەستام وگرێی کڕاواتەکەم شل وتوند دەکرد وبە جۆرێک دەستم تێوەردەداو بەوجۆرە تاوێکیش لەقەڵافەتی خۆم ڕادەمام وبەو جلکە تازانەوە کەیفم دەکرد.

ئەوێ ڕۆژیش هەر ئەو وەسوەسە ڕایکێشام بۆ پێش موغازەی خەڕازی فرۆشی. من خەریکی کاری خۆم بووم! هیچ ئاگام لێ نەبوو سەرم لە شووشەی پێش دووکانەکە کوتا و خرموهۆڕ شووشە کەوتە عەرزی! لەگەڵ وردە شووشە نێوچاوانی منیش قڕینجا و خوێن بەسەروچاومدا هاتە خوار. خاوەن دووکان کە چاوەڕوانی شتی وا نەبوو لێم هاتەدەر، بەڵام باش بوو خەڵکی تر هاتن کەوتنە نێوانێ. شووشەکەیان پێ بژاردم ولێم بوونەوە.

سەفەرەکە لەدوای چەند مانگێک خەریک بوو تەواو دەبوو، لەگەڵ ئەوەش کە لەو ماوەدا ئەوپەڕی هەوڵمدابوو بۆخاوێن ڕاگرتن و ئاگا لێ بوونی ئەو کۆت و شەڵوارە دەمدیت کە شەمزاون و جوانی و نمودی هەوەڵێ یان نەماوە، بێجگە لەوەی دەلینگ و سەر ئەژنۆی شەڵوارەکە چەند پەڵەی گەورە و گچکەیان پێوە دیار بوو، کە دیارە ئەوە شتێک نەبوو چارەی نەبێ، هەر لە ماندوویی سەفەر حەسامەوە قۆڵم لێ هەڵکرد بۆ خاوێن کردنەوەیان ودیسان ڕەنگ و ڕوویەکیان پەیدا کردەوە و هاتنەوە سەر دەق، بەجۆرێکی وا کە هەتا چوار پێنج ساڵ نەک هەر باشترین لیباسی من بوون بەڵکوو لە ناویاندا بەچاوێکی ترم تەماشا دەکردن لە میوانداری و هاتوچۆی لای دۆستان، تەنانەت چاوپێکەوتنی پیاوی گەورەشدا هەر ئەوان بوون کە لە هەموو کۆڕێک دەوەشانەوە. بە دڵنیایی دەمتوانی کەلکیان لێ وەرگرم، تەنانەت فیز - یشیان پێوە لێدەم.

لەساڵی شەشەم... بەڵێ چاکم گوت لەساڵی شەشەمدا بەداخەوە شوێنەواری تێپەڕ بوونی ساڵ ومانگ بە ئاشکرا پێیانەوە دیار بوو، بێجگە لەوە بەشێکی زۆر لە تووکە- کەیان وەریبوو.

دوگمەی کۆتەکەش زۆرجار لێرەولەوێ دەکەوت. وادەبوو لە جۆگەی خەیابان دەکەوت و ون دەبوو، دەلینگی شەڵوارەکە کە ئەو ماوەیە لە پانیەی پێڵاوەکەم خشابوو شی ببۆوەو ریشاڵی لێ هەڵ ببوو، زنجیری شەڵوارەکە چەند دانەیەکی لێوەری بوو، کردنەوە و بەستنەوەی هەروا بە هاسانی جێ بەجێ نەدەبوو، ئەژنۆی شەڵوارەکە وا دەرپەڕیبوو کە

ئوتوشم لێدەدا بە سەعاتێک وەک خۆی لێ دەهاتەوە .

بەڵام ئەوجاریش ئانیشکم لێ هەڵکرد، دەلینگی شەڵوارەکەم برێک نوشتاندەوە ودووگمەی کۆتەکەم دیسان لێناوە وبەروالێتکەم و کووڕیەکانم جێ بەجێ کردەوە. بەڵام ئیتر بەهیچ جۆر ئەو شازی ورازاوەیی یەی پێشوو - یان نەمابوو، هەر لە بەر ئەوەش ساڵەکانی دوایی دڵم پێیانەوە نەبوو، بە بێ نیگەرانی هەمیشە هەر ئەوانم لەبەر دەکرد من لەو لیباسانەدا هەستم بەحەسانەوە دەکرد، لەبەر ئەوە جارێک دوو جار نەبێ ئەویش بۆ ماوەیەکی کەم نێوکۆمێدیان هەر نەدی کە وەک دەڵێ : پشوویەکدەرکەن، بەبێ رۆژ بوێر بەو حلکانەوە لە سەر کاری خۆم حازر بووم و ئەگەر دەهاتمەوە ماڵێش پێمەڕەکاری وباخچە ئاودان و بژارم هەر بەو لیباسانەوە دەکرد، جار جاریش لەبەر ماندوویی بێ ئەوە کە بیان گۆڕم لێی تخێڵ دەبووم وخەوم لێدەکەوت .

رۆژێک کە بەماندوویی درێژ بووم. هەر وێژینگێکم دا بۆنی سووتاو وەخەبەری هێنام. بنە جگەرەکە لە دەستم کەوتبوو، بەری کۆتەکەمی لە لای چەپە سووتاندبوو ئاتەگی کۆتەکەشی هەر چەند نەسووتاندبوو بەڵام داغی کردبوو وزۆرباش ترساندبووی.

بەم جۆرە کۆت وشەڵوار وردە وردە کۆن بوون وگەیشتنە ئەورادەی کە دۆست وهاواڵ دەهاتن بەسەریان دەکردمەوە هەموو جارێ فڕولاتاو دەستی پێدەکرد و وادەبوو لەسنووری ئەدەبیش تێدەپەڕی :

- پیرۆزبێ قوربان، ئەوە تازە لەخەیات وەرت گرتۆتەوە؟ هێشتا قسەکەی ئەو تەواو نەدەبوو رەفیقەکەی تری دەیگوت :

-خوا بت پارێزێ، وریابە پێیانەوە لەچاو نەچی !

جاری وا هەوڵم دەدا باسەکە بگۆڕم. بەڵام چما دەستیان هەڵدەگرت ؟

رەفیقی سێهەمیان دەهاتە پێش. جگەرەیەکی بۆڕا دەگرتم وسەبرێک دەیگوت :

- ئەرێ قەت ئەو لیباسانەت بردۆتە لای مودیری مووزە ؟ئەو زۆر بەدوای ئەمشتانەدا دەگەرێ !

بەدوای ئەودا نەفەری چوارەم دەیگوت :

- ئەی ئەگەر لەرێگادا لە دەستیان رفاند؟

ئەوجار سمێل بابڕی پێنجەم کە هەر لەگۆشەیەک دادەنیشت وخەریکی کاری خۆی بوو، زمانی دەکراوە، لە قاقای پێکەنینی دەدا ودەیگوت :

"پەحا ... ئەوە دەڵێن چی؟ ئەگەوابێ ئەمن مردووم بۆخۆم دەگەڵی دەچم !.

ئاخری ئەو قسانە کاری خۆیان کرد و وەفکر کەوتم کە لەکۆڵ خۆمیان بکەمەوە بەپێچەوانەی ویستی خۆم تووش ئەو هەڵە مێژوویی یە بووم و کۆت شەڵوارم فرۆشت ا بەڵێ سەرەتای زستان بوو

که رۆژێک هاواری سمساری "کۆنه‌فرۆش" له کۆڵانه‌که‌ی ئێمه بڵند بوو. گوتم چش، با لێی بچمه پێش بزانم ده‌ڵێ چی؟ به‌دوو دڵی و له کاتێکا خه‌یاڵاتی جۆراوجۆر ده‌وره‌یان دابووم وه‌ک سه‌وداگه‌رێک له‌سه‌ر رێگایه‌دا راوه‌ستام هه‌تا هات گه‌یشته به‌رامبه‌رم.

– رۆژباش.

– رۆژباش کاکه، کۆت و شه‌ڵواریش ده‌کڕی؟

– به‌ڵێ.

– به‌چه‌ند ده‌کڕی؟

– ده‌بێ بیان بینم.

– فه‌رموو بیان بینه، له‌کاتێکدا کۆت وشه‌ڵواره‌که‌ی ئه‌و دیوه ودیو ده‌کرد:

– به‌چه‌ندیان ده‌ده‌ی؟

-تۆبڵێ.

– یه‌ک قسه یه‌نجا تمه‌ن.

– له شه‌ست تمه‌ن که‌متریان ناده‌م.

سه‌رتان نه‌هێشینم له‌دوای هێندێک سوێندخواردن وده‌بێ و نابێ ونێوبژی ده‌وروبه‌ر که له‌وماوه‌دا کۆببوونه‌وه، به پێی ئه‌وه که ده‌ڵێ: " نه قسه‌ی من بێ ونه‌ئی تۆ" سه‌ودا سه‌ری گرت له‌وکاته ناسکه‌دا کۆت وشه‌ڵواره به‌ناوبانگه‌که‌م له‌ده‌ستی بۆوه.

پاش به‌ینێک که‌وتمه‌وه فکری لیباس کڕینه‌وه رۆژێک به‌نیازی خه‌رید وه‌ده‌ر که‌وتم شه‌قامێکی گه‌وره‌ی شارم پشکنی که زوربه‌ی مه‌غازه‌کانی له‌و به‌رووبه‌رحلک فرۆش بوون، له‌وێوه سه‌روژێرم دایه بڕۆم بۆ بازێڕی گه‌وره" به‌ڵام چاوی کڕیارم هیچ شتێکی وه‌پاش نه‌ده‌دا له‌وبه‌ر له پیاده‌ره‌وی شه‌قامه‌که ده‌ستێک کۆت و شه‌ڵوار سه‌رنجی راکێشام، که له‌گه‌ڵ هێندێ لیباسی تر له‌وێ هه‌ڵاوه‌سرابوون، په‌ریمه‌وه لێیان چوومه پێش، وه‌ک بیانناسم وابوو، چوومه پێشتر نمره‌که‌یانم خوێنده‌وه ئه‌ی،ئه‌ی! زۆر سه‌یره! ناکا هه‌و بن؟! باوه‌ڕم نه‌ده‌کرد. لێیان وردتر بوومه‌وه.ده‌ڵێی به‌ریان لێگۆڕیوه، به‌ڵام له ئه‌سته‌ڕه‌که‌ی پێشووی کاڵتره. چه‌ند پاک و خاوێن وێ به‌اڵه‌ن. که‌موکووری یه‌کانیان هێنده‌ وه‌ستایانه چاک کردووه که هه‌موو که‌س ته‌نانه‌ت منیش به هه‌ڵه ده‌با، بڕۆسیان لێداوه، ورده‌تووکیکی لی‌په‌یدا بوته‌وه زنجیری تازه و نوێ،ده‌لینگی رێک وپێک،هه‌ر وه‌ک جاران ره‌نگی جوان ودروومانی باش به‌ڵێ خۆیان بوون به ئه‌ژنۆی خۆم دادا، ئه‌وه کار بوو کردم؟ ئای چۆن له‌ده‌ستم بۆوه! که‌وتمه یادی رابردوو وبرینم کولاوه، به‌تایبه‌تی ئه‌و برینه‌م کاتێک وه‌ژان هات که کوته کاغه‌زی سه‌ر قۆڵی کۆته‌که‌م خوێنده‌وه. لێی نووسرابوو "نرخی ٣٠٠ تمه‌نه" چ بکه‌م چ نه‌که‌م؟ بڕۆم لێیان گه‌ڕێم؟ بچم شتێکی تر بکڕم، لاقم ده‌به‌ست چوو بوو هه‌رچی کردم پێی رۆیشتنم نه‌بوو، نه‌خێر هه‌ر ئه‌وانه باشترن، نه‌خێر، نه‌خێر بۆخۆم بن باشتره! حه‌یف نیه وه‌گیر که‌سێکی تر بکه‌ون؟ خۆ من هه‌رده‌بێ لیباس بکڕم، به‌ڵێ ده‌ستم به‌گیرفانمدا کرد پاره‌که‌م بۆ کابرا بژارد فه‌رموو کاکه ئه‌وه‌ش سێ سه‌د تمه‌ن وئیتر خۆم له‌دوو دڵیه‌ش رزگار کرد. وبه کۆت و شه‌ڵواری دڵ خوازی خۆمه‌وه!! گه‌ڕامه‌وه.

# یەکسم (٣)

د.رەشە حمەدی

**کام کردن :**

هەر کات لەبەر چاوی یەکسمێک ئالیک وبەتایبەتی جۆ بدرێ بە یەکسمێکی دی و ئەو گوێی لە کرمە کرموشکانی جۆ لە زاری یەکسمەکەی دیکە بێ ونەیدرێتێ **کام** دەکا ، بەو مانایەی **مەڵاشووی ئەستوور دەبێ ودێتە رێکی ددانەکانی و لە لەوەڕ دەکەوێ** و جۆرە زارئێشەیەکی پێوە دەنووسێ بۆ چابوونەوەی بە نەشتەر یا سووژن چەند کونی دەمەڵاشوو دەکەن ، خوێی لە زاری دەخشێنن تا برینەکانی ببرژێتەوە.ئەوخوێ لە زار خشاندنە چەند رۆژان دووپات دەکەنەوە .

ئەوکارە دەبێتە هۆی چابوونەوە و لەپزیشکی ئەورۆ ـ دا **پەڕۆیەکی زوور وەک بووزووی رێدەخشێنن دوایە بە ترش وخوێ یاگریسیلین یۆدی یا سرکە چەند جاری دەشۆنەوە.**

**بەجۆ ئەنگاوتن :**

ئەگەر یەکسمێک لە رادەبەدەر جۆ بخوا ، با دەکا یا قەبز دەبێ و دەگیرێ و توانای رۆینی نامێنێ ، بۆ ئەوەی چا بێتەوە وشکەئالیکی لێدەبڕن و تەنیا وێنجەی تەڕی دەدەنێ و رۆژێ یەک دوو جار لە ئاوی دەگێڕن پاش چەند رۆژ دەفیرێنێ و چا دەبێتەوە ، ئەگەر زۆری با کردبێ رۆژێ کلۆیەکی ڕەژی لە زاری داوێن ، ئەگەر ئەو گرفتە لە زستاندابێ، ئاوی بۆ لە وێنجە دەپرژێنن وبۆی خاو دەکەنەوە .

ئەو نارەحەتی یە لە عیلمی ئەورۆدا بە دوو شێوە ناسراوە .ئەگەر یەکسم بای نەکردبێ دەرمانی رەوانی وەک : پارافین یارۆن گەرچەک یا رۆن بەزەرەکی دەدرێتێ بەڵام ئەگەر بای کردبێ لە دەرمانە توجارەتی یەکان کەلک وەردەگیرێ .

**کەرسمە :**

**ئێسکێکی وەک کرۆزەی لە کونا تفینکی یەکسمدا زیاد دەکا ووردە وردە پێش هەناسە کێشانی دەگرێ** . ولەوانەیە بخنکێنێ ، ولاغ لەو کاتەدا زۆر دەپرمێنێ و لووتی بەدار و بەرد و هەرچی بیگاتێ دەخورێنێ و بریندار ی دەکا و لە لەوەڕ دەکەوێ . رۆژ لە دوای رۆژ پتر لاواز دەبێ، بۆ چارە گوێی توند بە **ئێچک** و بەن دەبەستن . ئەگەر بەدفەڕی کرد لێوی خوارەوەشی **لەواشە** دەکەن دوایە بەسووژن یاگیرە **کەرسمە**کەی دەگرن و بە تیغ یا چەقۆیەکی تیژ دەیبڕن ئەو کارە بە بەیتاڵ دەکرێ وهەموو کەس نایزانێ. لەو پێیەدا لە دوکتورێکی ئاژەڵم پرسی گوتی :

ـ تا ئێستا شتی وامنەدیوە!

**مقاوی :**

جاری وایە **لەبەر چەنەی یەکسم برینێک وەک کوان پەیدا دەبێ** و جاری واشە ئەو برینە دیار نیە و یەکسم کۆخەیەکی توندی پێوەدەنووسێ پشووی سوار دەبێ و لە هەوراز باش ناڕوا وئاوی بە کونە لووتدا دێتەخوار ، تاماندووتر بێ پتر دەکۆخێ بۆ چابوونەوەی لێی دەگەڕێن لە جێ یەکی گەرم بحەسێتەوە ، جەماوجەم هێلکەیەکی کاڵ لە گەروویدا دەشکێنن ، کاتێک برینی بەرچەنەی دڕا بەبرین و کونەلووتیدا جەراحات و هەوا دێتەدەر وچا دەبێتەوە.

ئەگەر کای بۆ زەرد کرێ و دەتوورەکەدا بیدرێتێ زۆر قازانجە .

**ئیپلیک :**

ناوی عیلمی وی **ئامغیزیمی ئەهوەنە** وشەی عەڕەبی بەمانای هەڵمسان و لەبەریەک چوونە ،

**ئامفیزێم** لەدەزگای هەناسە کێشان بریتی یە لە هەڵمسان و ئەستووربوونی پۆرگەکان و کەند وقووڵەکانی نێوسیپەلاک کە دەبێتە هۆی پچڕانی دیوارەی وان ورەدبوونی هەوا بەنێو ئەو پۆرگ و کەند و قووڵانەدا .

هەوای ساردونمدار وچڵکی نێو گەرووی پاڵ بەسیپەلاکەوە دەنێن ولە ئاکامدا کەند و قووڵەکانی نێوی لەبەریەک دەکشێنەوە ودەبێتە هۆی نەخۆشی ئیپلیگ . یەکسمێک کە دووچاری ئیپلیگە ، لەکاتی حەسانەوەدا نەخۆشی لێ دیار نیە ، بەلام هەر ئەوەندە تۆزیک کار بکا وماندوو بێ تێک دەچێ و لەسەر یەک دەکۆخێ وپشووی سوار دەبێ . پشوو بەجارێک هوڵدەمژێ بەلام بە دووجار دەری دەداتەوە کە ماوەی جاری دووهەم لە جاری ئەوەڵ درێژترە . بە داخەوە دەرمانێکی سەرەکی بۆ نەدیتراوەتەوە وئەوەی دێدە-نێ تەنیا دەبێتە هۆی ئەوەی یەکسم کەمێک زیاتر خۆرابگرێ

**بەیتاڵەکان مارمێلکەی زیندوویان لە گەرووی یەکسم داویشت یا رۆن ورچیان دەدایە یا هێلکەیان لە گەروودا ، دەشکاند** .بەلام ئەورۆ بۆ ئەهوەن کردنەوەی یەکسم لەو دەرمانەی خوارەوە کەلک وەردەگرن :

١- **ئەندریدئارسینۆ** بە رادەی نیو تا سێ گرەم بە ماوەی حەوتوویەک .

٢- **نوامیک** لە دوو تا دە گرەم .

٣- **ئادرنالین** .

٤- **سولفات ئاترۆپین** رۆژێ پێنج سانتی گرەم بە دەرزی ، لەژێر پێستی دەدەن و وەک دەرمانی کۆمەکی کەلکی لێ وەردەگیرێ .

**ژان :**

لەزمانی عیلمیدا **داورید یا کولیکی پێدەڵێن** . ژان چەند جۆر بەدی دێ :

١- بەهۆی پڕ بوون یا ئەستووربوون یا برین و یا بوونی کرم ، یەکسم نەخۆشی ورگ دەگرێ .

٢- پڕ بوونی ریخۆڵە یا لێک هالانی ریخۆڵەی باریک یا چوونە پاڵ یەک و با کردن وەکۆ بوونەوەی خۆراکی زۆرو زیادی یا بەرد یا تۆپە لە نێو ریخۆڵەدا .(تۆپە چی یە ؟)

**یەکسم جاری وایە لەبرسان یا لە خۆشەویستی یان یەکتر یا خۆیان دەلێسنەوە ، مووی زیادی بەزمانیانەوە دێ و قووتی دەدەن . لەئاکامدائەو تووکە وردانە لەسەر یەک دەبنە گلۆڵە و وەک تۆپێکی پتەو وقایمیان لێدێ ودەبنە هۆی نارەحەتی یەکسم .**

نارەحەتی جاری وایە لە میزدان وگورچیلەکانە و جاری واشە لە لێک هالانی منداڵدان ولە مایندا لەبەر هاویشتنەوە سەرچاوە دەگرێ .

ئەوەی ئێمە مەبەستمانە ژانێکە کە یەکسم پاشماندوو بوون بە هۆی لەنەکاو خواردن و خواردنەوە تووشی دەبێ ، ولاغ زۆر خۆی لە عەرز رادەکێشێ وهەروەها خۆ لەبەر یەک دەکێشێتەوە . یەکسم ئەگەر نەتوانێ میز بکا دەتۆپێ . لە کوردەواریداهەر کات ولاغێک ژان بکا ،دەگەڕێن بەدووی **ئاوەڵ دوانە** تا بێ و دەستی بەزگی دابێنێ ، دەنا کەچەڵێکی بانگ دەکەن سەری لەزگی بخشێنێ، بە بڕوای بەیتاڵەکان بەوکارە ژان و برکی یەکسم چادەبێتەوە یابە تیغی تۆزێک گوێی یەکسمی دەخوێن دێنن .

**مشمشە :**

نەخۆشی مشمشە تایبەتی یەکسمە ، جاری وایە کوت و پڕ و جاری واشە وردە وردە لە ولاغی توند دەکا ، یەکسمێک کە ئەو نەخۆشی یە دەگرێ لە پێشدا سەر سیپەلاک و پێستی دانار دانار و گرموولە گرموولە دەبێ ، ئینسان ئەو نەخۆشی یە دەگرێتەوە ، ئەو نەخۆشی یە کۆنە و تەنانەت یۆنانی ورۆمی یەکانی قەدیمیش لە بارەیدا دواون گەلێک یەکسم لەناوچەکانی دنیا دووچاری ئەونەخۆشی یە بوون بەتایبەت لەشەرەکاندا کە ژمارەیەکی زۆر یەکسم لە جێ یەکی کۆوە بوون، ئێستر و

ئەسپ ئەو نەخۆشی یە لەسەرەخۆ دەگرن لە حالێکدا گوێدرێژ کوت وپڕ بەو دەردە دووچار دەبێ .

ملۆزمی ئەو نەخۆشی یە (پزودۆمۆناس مالئی)یە ئەو نەخۆشی یە زۆر پیسە و یەکسم زۆر زوو لێکتری دەگرنەوە .

مالاتێک کە بە هۆی ئەو نەخۆشی یە بتۆپێ دەبێ باش چالّ کرێ دەنا کەلاکەکەشی دەبێتە هۆی تەنەوەی نەخۆشی

تەنانەت ملۆزمی ئەو نەخۆشی یە لە تەویلەوئاخورو ئەسباب و ئامرازی تیمار کردنیشدا دەمێنێتەوە .

نیشانەکانی نەخۆشی مشمشە ئەوانەن :

۱ـ نیشانەکانی مشمشەی توند ووکوت وپڕیەکسم تووشی یاووتاو دەبێ و زۆر گەرم دادێ، ئێستیای نامێنێ بە نارەحەتی یەوە هەنگاو هەلدـ ێنێتەوە ، پێستی وشک و داغ دەبێ وپەلە پەلەی سووری دەکونەلووتیدا پەیدا دەبێ ، ئاوێکی زەردی بە لووتیدا دێتەخوار .وردە .وردە تێکەلاوی خوێن دەبێ و دەگەنێ .

لەسەر پێست،جاست ئێسکی پەراسوو ، دیوی ژووری ران و گەرن و بەرچاوو لێوەکانی پۆرگ دەر دەکا وپاش چەند رۆژ هەر ئێسکەکانی دەمێنێتە ـ وە . یەکسم پتر لەدەرۆژ لە بەرامبەر ئەو نەخۆشی یەداخۆ راناگرێ .

**مشمشەی ئەهوەن :**

لە یەکسمەکاندا پتر ئەسب تووشی دەبێ،ئاوی لووتی زەردو بۆگەنیوە جاری وایە تێکەلاوی خوێنە وتێو لووتی دەبێتە بلۆق . زوو ئەو بلۆقانە دەبنە برین و رۆژ ، لەگەلّ رۆژ قوولتر دەبن و وردە وردە بن گەرووشی ئەستوور دەبێ .

ئەورۆ بۆ ناسینی ئەو نەخۆشی یە بەدەرزی هێندێک مالئین لە تێوەراست پێلووی چاوی دەدەن .پاش ۲۴ تا ۳۶ سەعات لە رووی خوروو سوور بوونەوەوئاوکردنی چاوی ئەو یەکسمە تێدەگەن تووشی ئەو نەخۆشی یە بووە یا نا . بە پێی لێکۆلینەوەیەکی زۆر تێگەیشتم کە لە کوردستان ئەو نەخۆشی یە بەنێوی " **مرخە** " دەناسن . بەیتالەکان بەپێی تەجرەبەی چەندسالەی خۆیان دەلێن یەکسمێک کە تووشی مرخە دەبێ بەیانان بەرلەوەی زەردە بێتە دەر رووبەرووی تاو رادەوەستێ .

نەخۆشی "مرخە" هیچ دەرمانێکی نە و بۆ ئەوەی بەرگری لە بلاوبوونەوەی بکەن بە زووترین کات یەکسمی نەخۆش لەنێو دەبەن .دەولەت لە بەرامبەر سێ نەخۆشی **سیل** و **تەبەق** و **مرخە**دا بەرپرسە ئەگەر ئاژەلّ بەیەکێک لەو نەخۆشی یانە دووچار بێ خەسارەت دەدرێ بە خاوەنەکەی و نابەلێ تووشی زەرەر بێ .

**سەکبایی :**

ئەو نەخۆشی یە لە سەرماو باران وتەڕ وتووشی‌دا پتر یەکسمی حەیلّ دووچاری دەبێ و پاشووی لە حەڕەکە دەکەوێ و تەنیا لەسەر پێشووی رادەوەستێ و کەفەلّی لەعەرزی دەخشێنێ .یەکسمی وا شەو و رۆژێک تا دوو شەوو دوو رۆژ دەکۆیە بنی ئێشک دەگرن تا تەواو گەرمدابێ لە پاشان بە بەتێکەمووی سەر پشتی وەک چنین وهۆندنەوە دەهۆنەوە

# دوستی دوژمن

ئەمجەد حاج ئیسماعیل زادە

بەلێ، هیچ سەرتان ئەستوور نەبێ. هەروەک گوتم دوژمنی ئەوانەم کە (خۆشیان دەوێم) دوژمنی قەستەسەری ئەویندارانی خۆمم! بەخوێنی سەری ئەوانەی کە تاوێک بێ من هەڵناکەن تینووم! ڕەنگە ئێستا نەزانن من چیم! با زیاتر خۆم بناسێنم. ئەگەر لێم بپرسن جێگام کوێیە و خەڵکی چ وڵاتێکم. وڵام دەدەمەوە من خەڵکی هەموو شوێنێکی دنیام لە بەستەڵەکەکانی قوتبی شیمال را تا بێروونەکانی ئەفریقا وئاسیا. لەشاری پرحەشامەت وگەورەوە تا دەگاتە کوێرە دێیەک، سەرتان نەیەشێنم لەهەر شوێنێک ئادەمیزادی لێ بژی منیش دەژیم. با زۆرترتان روون بکەمەوە، لە زوربەی ماڵاندا، لە دوکانان ئیداران، کووچە وشەقام، نێو تاکسی، قەتارو پاس و لە زۆر جێگای دیکەدا من هەر لە نێو خەڵک دام، وەتاغی میوانان بێ من نابێ. لیباسی جوان ورەنگاورەنگم دەبەر دەکەن. وهەزاران نێوی جیاوازم لێ دەنێن کە بەخەتی خۆش لەسەر جل وبەرگم دەنووسرێ. بەڵام من هەریەک شتم! دوژمنی بەرەی ئادەمیزاد! من دوژمنێکی پڕخەرجم! هەر کەس منی بوێ دەبێ لەداهاتی رۆژانەی خۆی هیندێکی بۆ من تەرخان بکا! ئەوانەی منیان خۆش دەوێ رۆژێ چەند جار ماچم دەکەن. رامدەمووسن هەڵم دەمژن! هەر چەند زۆر کەس دەزانن ئەویندارى لەگەڵ من بەرهەمەکەی زووخاو دەرد ومەینەتە. لە سەر ئەوەش را دەست بەردارم نابن.

من زۆرئێسک سووک و رەزا شیرینم. قەدبارێک ورێک و پێک ونازەنینم. بۆن وبەرامم خۆش ودڵ بزوێنە. وەرەزی پیاوی ماندوو دەشکێنم وزۆر، کەس بەمس نەشئە دەبن وبە ئەوینی خۆیان دەسووتێنن! بەڵام با پێتان بڵێم. خۆشەویستی وئەوین کار ناکەنە سەر ئاکار ورێبازی من! من حەزم لەکوشتنە! من لە سلامەتی وتەندروستی بێزارم! مەرگ کەسب و کاری منە! لەسەر ئەو قەدو باڵا جوانەمرا، گیانم، رووحم، دەروونم کەیلی کینەونفرەتە! و هەموو ساڵێک هەزاران تەرمی ئادەمیزاد رەوانەی گۆڕستان دەکەم.

دوکتۆرەکان باشم دەناسن دەزانن قاتڵی ئادەمیزادم دەزانن نیزیک بوونەوە و تێکەڵاوی لەگەڵ من پێشوازی لە مەرگە! بەڵام زۆر جاری وایە ئەوانیش دەکەونە داوی ئەوینم وهەر ئەوەیان بەسەر دێ کە ئەوانی تر تووشی دەبن. ئەوەندەش با پاکانە بۆخۆم بکەم! ئادەمیزاد بۆخۆ دەست بەردارم نابن من کارێکم بەوان نیە. بەڵام ئەوان بە شوێنمدا شەیدا و وێڵن.

ئەوەشم بالەبیر نەچێ. بە پێچەوانەی هەیکەلی جوان و ناسک ولەبەر دڵانم لە هەر جێگایەکی دەستم بدەنێ و کەلک لەجوانی وتام و بۆنم وەرگرن هەوا پیس و چەپەڵ دەبێ و تەم ومژێکی سینە ئاخن هەموو شوێنێک دادەگرێ.

رەنگە تائێرە منتان ناسیبێ وبزانن من چیم. ئەگەر نازانن من "سیگارم" کەبە کوردی پێم دەڵێن " جغارە" و دوژمنی قەستەسەری هەمووتانم بەڵام بۆئەوەی خوێنتان بە دەستی من نەرژێ پێشنیارێکم هەیە :

"لێم گەڕێن بالێتان گەڕێم!

# کاك ئـەڵڵا

. لەماڵێک میوان کرابووم

چەند کەسی دیکەش لە دەورو بەرم بوون.هەرکەسە باسی لە شتێک دەکرد . وای لێهاتبوو کەس لەکەس حاڵی نەبوو. یەک باسی سیاسەتی دەکرد ، یەک باسی دەغڵ ودان وحاسڵی ئەو ساڵی دەکرد ،یەک لەماشێنی دەدوا یەک لەکۆپین و....

لەم قسانە دابووین یەک وەژوور کەوت پیرەپیاوێکی بێ ددانی دەم بەپێکەنین سڵاوی کردوگوتی :

**- رەحمەتی خوداولێ بێ کەس نەبزوێ ئەوەندەی گوت و چاوێکی بەدیوەکەدا گێرا ولە سووچێک لەسەرچۆک دانیشت .**

وێگرا بەخێرهاتنمان کرد .

یەک لەیەنام دانیشتبوو لێم پرسی ئەم پیاوەکێ یە ؟

- وەک هەڵەیەکی گەورەم کردبێ گوتی :

- ئەی چۆن؟ تۆ ئەوە ناناسی

- گوتم : ناوەڵڵا بەرەنگ نەمدیوە بەڵام دەنگی ئاشنا یە

کوتی :

**- ئەوە کوێخا ئەڵڵا یە..**

بە بیستنی ناوی کوێخا ئەڵڵا شاگەشکە بووم .

هیچ سەیرنیە .کوێخا ئەڵڵا پیرەپیاوێکی دەنگ خۆشە و ئەگەرلەرادەبەدەر پیرە ودم ودانی نەماون بەڵام ئێستا دەنگی هەرخۆشە وچەبدنەوارشم لەدەنگی وی هەیە .

هەرواچاوی دەگێرا پێم وابوو لە حەفتا تەمەنی تێدەپەڕێ . بەڵام ئێستاش هەرواقیت ولەباروبەکەیف و دەماخ بوو .

پێم خۆش بوو دەرفەتێک هەڵکەوێ وهیندێکی بدوێنم . وت وو وێژێکی لەگەڵ بکەم .هاتم زارم هەڵبرم ،کە بۆخۆی رووی لەپیرەپیاوێکی دیکەکرد و گوتی :

**- حەمەد ئەوەبۆ دەڵێی دولمەی هەڵوەشاوی ؟**

کابراش لەسەرخۆ گوتی :

- کوێخا ئەڵڵا کەس وەک تۆی پێ ناکرێ .. تۆ خەمت نیە

**- کوڕە ماڵت خرانەبێ دنیات تەنگا وتێلە داوە .هەر کەس وابێ زوو پیردەبێ قەت فکرلەدنیایە مەکەوە . عاقیبەتی هەرمردنە .**

جا ئەمنیش دڵم وەک تۆخۆش باوئەودەنگ وسەدایەم پێوە باو ئەوهەموو بەیت وحەیرانەم زانیبا پیرنەدەبووم .

هەموو مەجلیس پێکەنین وبۆ ماوەیەکی کورت قسە برایەوە .

منیش بۆ ئەوە سەری قسەی

لەگەڵ بکەمەوە هێندێکـــــم
قەراخ وبیجاغ تێک کردنەوە و
دوایە گوتم :

ـ مام ئەڵڵا ،ناوی خـــۆت
چیە ؟ وات پێدەڵێن ؟
گوتی:

**ـ ئەها ئەوەش لەوســـــەر**
**رووتە تۆلاسانەیە .کورەبابـــم**
**ئەتۆهەوەڵ کەس نی ،زۆرکـــەس**
**ئەوقسانەیان لێ پرسیوەئەمما**
**بەکاری هیچ نەهاتووە؟ جارێ**
**پێم بڵێ بۆ چیتە؟**

لەخودام تەڵەب بووئەوەم
لێ بپرسێ .چون زۆربە وردی
پێم گوت کە من کێم وبۆچـــی
لێی دەپرسم .
گوتی :

**ـ ئەوەی راست بێ دەزانـم**
**زۆران ئەوقەولەیان پێ دوام**
**وهاتوون وەک مەئمـــووری**
**ژاندرمەی قەدیم هەموو بن و**
**بنەچەکەیان پێ دەکۆڵەکـەی**
**کردووم وجاری دوایـــــەش**
**نەمدیتوونەوە .**

من بەڵێنم پێداکەمـــــن
حەتمەن ئەو بەڵێنییەی دامتا
ئەوجێگەیەی لەدەستـــم دێ
دەیبەمەسەر .
گوتی :

**ـ جاکاکی برای من نـاوم**
**عەبدوڵڵایەو بەکوێخا ئەڵـــڵا**
**منشوورم . لەسجیلیشدا نـاوم**
**عەبدوڵڵای ئەمینی ئازەرە .**

ئەم ناوەش بۆخۆی نامـــۆ
نەبوو . ئەمینی ئازەر......
ئەمینی ئازەر وەبیرم هاتەوە
کەبەیت پێژێکی دیکەشم هەربەم
ناوونیشانە دەناسی کـــاک
**حوسێنی ئەمینی ئازەر** کەبــە
**"وسێن زارخوار"** بەناوبانـگ
بوو .

چون شۆرەت زۆرونێک دەچێ
پرسیارم لێ کرد .

ـ مامەکاک وسێن چێە ؟

**ـ ئەی! برامە .من بــرای**
**وسێن زارخواریم کوری مینەم**
**خەڵک پێ یان دەگوت مینەسوور**

ـ دەی باشەخەڵکی کوێی ؟

**ـ جابابم پیاوی فەقیــر .**
**خەڵکی کوێ یە .من هەوەڵـــی**
**لەخەڵیفانێ بووم لەوێ کوێخا**
**بووم .دوایەش هاتوومـــــە**
**کولتەپە وئێستاش ئەوەڵێردەم.**
**(مەهاباد) .**

هەروانێوەنێوە قسەی خۆشی
دەکردە نێوئاخنی وت ویێژەکەی.
شتێکم زۆربەلاوە سەیربوو.
وەکی باسی دەکرد تەمەنـــی
دەبوو زۆربێ و بەرواڵەتیش
وای نەدەنواند .

ـ کوێخا ئەڵڵا تەمەنت چەندە

**ـ کورە جاچووزانم! خـــۆ**
**ئەمن سەو ادم نیە تابزانـــم**
**چەندساڵ دەبم .ئەوەنـــدەی**
**دەزانم ئەوەدەمی مظفرالدیـــن**
**شای قەجەر لەسەرتەختی بـــوو**
**بەجوانی وەبیرم دێ تائێستا**
**٦ دەورەم دیوە .(بەسێ قەجەرەـ**
**وە ) .**

ـ تۆدەنگت خۆشەبەیتانیش
دەزانی ؟

**ـ بەڵێ ئەرێ وەڵـــــڵا**
**بەیتانیش دەزانم .**

ـ وەک چی

**ـ هەرچی حەیرانە دەیزانم**
**سەیدەوان ،لاوک ،کراس رەشـێ**
**وەی وەی زارا ـ گوڵەجـــوان**
**قوندروکی ـ سوارو ـسەعیـــد**
**بەگ ، ومیرسیوەدین چووزانم**
**خۆ هەرچی دەیزانم ئێستالـــە**
**بیرم نین .**

ـ ئەوبەیت ولاوک وحەیرانە
لەکوێ فێربووی ؟

**ـ جاچوزانم! هەرلـــــە**
**منداڵیەوە کەیفم بەبەیت و**
**حەیرانان دەهات ئەممـــــا**
**ئەوانەی زۆریان لێ فێربووم**
**خوداعەفوویان کا لەگـــەڵ**
**مردووی تۆ،ئەحمەدی کارسوری**
**وکاک هەباس ونادرەکوێربوون.**

ـ مام نادرکێیە .

**ـ مام نادربابی ئـــەو**
**رەسووی نادری یە کەئێستـــا**
**ماوە وگۆرانی وحەیران و**
**بەیت وقسەی خۆش دەڵێ .**

ـ ژنت هێناوە ؟

**ـ بەڵێ لەخەڵیفانێ ژنـم**
**هێناوە و ئێستاش ٥ کورم هەن**
**ماشاللە دەڵێی منارەن .**

ـ خودالێت نەستێنێ

**ـ لەگەڵ ئی موسلمانان..**
**گوڵەجوانی گوت .وا مزانی**
**ئێستا لەکوێستان وهەوارانلە**
**نێو پۆلی گوڵەجوانـــان**
**راوەستاوم وگوڵەکان دەردی**
**دڵم لەگەڵ دەکەن لەلایەکمەر**
**لەلاپالێک مۆڵ دراوە.لای دیم**
**شوان لەسەرکانی نێوقـــەدی**
**شاخ فوولەکوچکێ ئاورەکـــەی**
**دەکا و لەلای دیم شـــۆرە**
**سواران دێن ودەچن .**

## چاوەڕێ

س. ڕەشیدی ئازەر

سروەی ئازیزم
شنەی نەرمە لاوێنی لەشی
بوونی بەتەم خنکاو
شیرەتیژەکەی باڵی مەلی پەت بڕ
بەرهەمی ڕوونی چاوی دڵی سووتاو،
جەرگی هەڵقرچاو،
چاوەڕێتم.
چۆن بۆرچین
چاوەڕێی بچکۆڵەی نەماوی،
بەدەس ئاگرا برژاوییە.
یا چۆن دەریا،
دڵ پڕلە هومێد
چاوەڕێی بزاوی
خاوەن ڕەنگاوی سڕی شەپۆلە
منیش چاوەڕێتم
سەرماوسۆڵە
دەخیلتم، زریانە
هەتاو کەسیرەیە،
شەوی درێژی زستانە
لەبیرت نەچێ سروەگیان
هەتا دەتوانی زوو وەرە
هەتا دەتوانی زوو وەرە

## بەهار

م.ن. عەلایی

ئەم وەرزە کەوا نەشئەدەری خاک و چیایە
ڕازاوەی دەستێکی هونەرمەندوسەخایە
ئەم خاک و دەرو دەشت و کەژوکێوی وڵاتە
وەک باغی بەهەشتێکە کەوا بۆ عورەفایە
ڕۆح بەخشە نەسیمی فەرەح وبادی بەیانی
بۆ دەردو ئەلەم وەک نەفەسی لای مەسیحایە
بولبول بەسەما هاتەدەر و عاشقی دڵڕیش
بۆ خەندەی گوڵ قەلبێ حەزینی لە فەنایە
بڕوانە لە کەو چۆن دەفڕێ ئەمبەرو ئەو بەر
خاڵی ڕەشی سەرسینگی چ خۆش خەتت و جەلایە
"سروە"یشی لەبۆ زیادە لە سروەی سەحەریدا
بۆ دەفعی هەموو دەردی دڵان عەینی دەوایە
ڕووح و دڵی "نافع" کە هەمووشێتی بەهارە
قوربانی ئەوەی بێ کە دژی جەوروجەفایە

# لەگەڵ شیعری

هاوین وەک سروەی خۆشی بەیانی
فێنک کەرەوەی دڵ و گیانی
پایز کە فەسڵی گەڵاڕێزانە
کاتی وەرین و زەردی وخەزانە
تۆ باخی سەوزی دوور لەخەزانی
سەیرانگەی منی شەو تا بەیانی
زستانان لەبەر گڕی وشەی تۆ
دەست و دڵی من گەرم ئەبێتۆ
دووری و غەریبی فەرامۆش دەکەم
خۆم لە ئامێزی وڵات هەست دەکەم
یاخوا بمێنی و سەرکەوێ ڕێگات
باسەدان "وەیلان" بە ئاوات بگات

## سروە

"وەیلان"

سروە زمانی گەرمی وڵاتم
ساڵی چوارکەرەت من بەتەماتم
بەهاران وێرای شنەی بای شەماڵ
بەفری خەمی دڵ تۆ دەدەی ڕامالّ

## خەمڕەوێن

«زاهید کازمی»

بای شەماڵ خەبەری هێنا
بە لەنجەولار خۆی هەڵێنا
جاڕی دا لە شار و لادێ
وا زستان ڕۆیی بەهار دێ
جا ئەگەر لە دڵتا یە خەم
دایگرتووی پەژارە وماتەم
"سروە" بخوێنەوە کاکە
ئەی چەندخەمڕەوێنی چاکە!

# شاعیرانی لاو

بەهاری ئەوساڵ من گوڵم نەدی
بەهاری ئەوساڵ بولبولم نەدی
بەهاری ئەوساڵ نەمبیست ئاوازێ
بەهاری ئەوساڵ نەمبوو هاوڕازێ
فەلەک بروو خێی ماڵت وێران بێ
باڵندەی شادیم تاکەی بێ لان بێ

«تاها حوسێنی»

## ڕێبوار

«ڕەحیم لوقمانی»

ڕێبوارێکم ڕێم سەختە و دوور
دەڕۆم دەبڕم شوورەی سنوور

روو لە هەورازی سەد کێوم
ڕێی ئامانجی بەرز ئەپێوم

ئازار گەستە و تینوو و برسی
چوار دەوری ڕێم پڕ مەترسی

لە تاریکی و شەوە زەنگا
بەنێو تەلان و زەبەنگا

هەزار قۆناغم بڕیوە
شەوگاری تاڵم زۆر دیوە

تروسکەیەک، تیشکێ، تاوێ
لێم دەرنەکەوت سۆما بناوێ

بە زستان و تۆف و سەرما
چەندە هەرەس هات بە سەرما

زۆرجار هەڵدێرام لە زەردان
جەستە خەستەی داو و دەردان

بەڵام هەرگیز من لام نەدا
قەد بە کۆڵ دان مدودا مەدا

هەزار شوورەم شکاند، بڕیم
بە کۆسپی مەرگا تێپەڕیم

ئێستا پوختە و خاراوترم
مەرگ ئەمرێنم، خۆم نامرم

تێشووی ڕێگەش ئیمانمە
بڕوا و ئەزموونی ژیانمە

بەرەو دوندی ئاواتی خۆم
دەڕۆم، دەڕۆم، دەڕۆم، دەڕۆم

کەوتن، هەستان، هەنگاو، هەنگاو
تا دەگەم بە ژوانگەی هەتاو

ع . نانەوازادە

رۆژێ گورگێک کەبرسیایەتی شاڵاوی بۆهێنابوو لەلێرەوار وەدەرکەوت گەیشتە رێبازێک کە بە تەنیشت لێرەوارەکە دا تێ دەپەڕی .گورگ ملی رێگای گرت و وەرێ کەوت تا بەڵکووشتێک بدۆزێتەوە وبیخوا .

نزیک گوندێک دیتی لادێیەکی پیر لە قەراغ رێ رۆنیشتووە وخەریکی نان خواردنە گورگ لێی چووە پێش وگوتی :

ـ مامە ئەوە چ دەخۆی ؟

ـ نانی دەخۆم

گورگ کەزاری پڕببوو لە ئاو گوتی :

ـ من هەمیشە گۆشتم خواردووە ونازانم نان چیە وچ تام وچێژێکی هەیە .زۆریشم برسی یە ئەگەر دەکرێ کەمێکم نان دەیەبیخۆم .لادێیی پەنجەیەکی نان بۆهاویشت گورگ لەحەوای قۆزتیەوە وخواردی بەزمانی دەوروبەری زاری لێستەوە وگوتی :

ـ زۆر بەتامبوو ئێوە ئادەمیزادەکان هەموو رۆژێ لەم نانە خۆشەدەخۆن ؟

لادێیی کوتی :

ـ بەڵێ هەموو رۆژێ .

گورگ کوتی :

ـ منیش زۆرم پێ خۆشە کەپێخۆرم هەرنان بێ دەبێ چ بکەم چلۆنم وەچنگ دەکەوێ ؟

لادێیی گوتی :

ـ کارێکی نیە !! گەنم داچێنە ونان بخۆ

گورگ گوتی :

ـ هەروا بەوهاسانی یە ؟!

لادێیی وڵامی داوە:

ـ ناواهاسانیش نیە لەپێش دا دەبێ پارچە زەوییەکت هەبێ جاچۆن ئەم زەوی یە وەچنگ دەخەی بۆخۆت دەزانی . چونکە گێرەوکێشەیەکی زۆر لە سەرزەوی دەکرێ کە جێگای نیە بۆتی باس بکەم.کاتێک زەوی یەکت وەچنگ خست دەبێکێڵی .هەڵبەت دەزانی بۆ کێڵانیش دەبێ چ بکەی ؟

گورگ گوتی :

ـ نەخێر ناوەڵڵا هەرهیچ نازانم .

لادێیی گوتی :

ـ ئەگەر تاقەتت هەیە وماندوو نابی با هەر لەهەوەڵێوە بۆتی بگێڕمەوە .

گورگ گوتی :

ـ زۆریشت لێ مەمنون دەبم فەرموو

لادێیی گوتی :

ـ لەپێشدا دەبێ دووگا دەگەڵ نیرو ئامورێک وەگیر بخەی زەویش دوو جۆرە یان دێمەکارە یان بەراو . ئەگەر بەراو بێ دەیکێڵی وئاوی لێدەگری کە پێی دەڵێن کەشاو کاتێ وەگاهات یانیوای لێهات کەنەقوڕ بێ و نەوشک بووبێتەوە کووز کووزی دەکەی تۆو لە توربێن دەکەی وپێوەردەکەی ودووبارە دەیکێڵیەوە . لەدوایی ماڵووی دەکەی و جۆگەی لێدەدەی . ئەوە بۆبەراو . بۆدێمەکاریش

تاکوو گەنمەکە هەڵبدا و گوڵ بکا لەتەوای ئەم ماوەیەدا دەبێ لەقەدەر پێویستی پێی ڕابگەی گوڵەگەنم کەزەرد بوو وئەوجار دەتوانی بیدروویەوە .

گورگ کەتاقەتی بەسەر چوو بوو هەرای کرد :

ـ ئەوەدەم ئیتر دەکرێ نانی بخۆی ؟

لادێیی گوتی :

ـ نا هەندێک لەسەرەخۆ بەو چاک گوێ ڕاگرە ئەوە تۆ بۆ ئەوەندە کەم جیکلدانەی .

هەر تۆوی پێدا دەپرژێنی ودەیکێڵی وبە ئومێدی خودا بەڕەڵڵای دەکەی

گورگ گوتی !

لەوانەگەڕێ ،چۆن دەبێتەنان باسی وەی بکە

لادێیی گوتی:

ـباشە پێت دەڵێم . لەدوایی ئەگەر زەوی ـ یەکەت بەراوبێ دەبێ ئاوی بدەیوپلاوی‌کەی هەڵبەت ئەویش لەبەهار دا ئەگەر هاتوباران کەم باری . دوایە سێچوارمانگ دەبێ سەبر بکەی

کەکاتی دروێنەهات دەیدروویەوە ئەگەر بەداس بیدروویەوە ، قۆڵ قۆڵ دەیانکەیەسواڵە سواڵە سواڵە دەیانکەیە مەڵۆ ،مەڵۆکانیش دەکەیە باقە وباقەکانیش لەسەر یەک دادەنێی تاکو دەبێتە گیشە ئەم گیشانە ماوەیەک لەبەر تاو دەمێننەوە تاکووباش ئیشک دەبنەوە . پاش ئەدەرێک دەبێ جێ خەرمان ئامادە بکەی جایان لە مێرگێکی تەخت وبێ کون وکازێر یان دەبێ جێگەیەکی تەختی لە ڕەوی‌دا بۆئاو بدەی ،کاتێ وەگاهات مالاتی لە سەر دەگێڕی

تاکوو رەق وپتەو دەبێ .کە جێ خەرمـــــان ئامادە بوو ،گەنمەکەت دەبەیە ئەوجێخەرمانـە جوان بلاوی دەکەیەوە وبە مالاٌت گێرەی لەسەر

بەلێ کە ئاشەوان ئاش بەتالی راگەیانـــد ، بارەکەی بۆدەبەی وئەویش خاوێنی دەکاتەوە ولەبووجارێ دەدا ودەیهارێ ودەیکاتە ئارد . ئاردەکەی هەلدەگری ودەیبەیەوە ،بەئاولـــە کوول دا هەویری لێ ساز دەکەی .هەویرترشـی لێدەدەی تاکووبکەوێتەوە .کاتێک هەویـــر کەوتەوە ئەنگووتکی لێدەگری ولەسەرپنە ،تێـر یان وەردێنەیلێدەدەی ولەسەر رفێدە پانـــی دەکەیەوە ....

گورگ کوتی :

دەکەی .دوای ئەوە کە گێرە تەواوبـــوو هەلیدەدەیەوەکە دەبێتە جێخون .ئەمجارشەنـی دەکەی وکاودان لێک جوێ دەکەیەوە .لەداشگیرو کەوی دەدەی تاکوو گەنم وچەت جیادەبنەوە . ئەمجار گەنمی سوورت وەچنگ دەکەوێ . لـــە تەلیسانی دەکەی وبە سواری گوێدرێـــژ دەیبەیە ئاش.........

گورگ کە دیسان تاقەتی لێ برابوو کوتی :

ـ ئەمجار دەبێتە نان ودەیخۆم

لادێیی زۆرلەسەرەخۆ کوتی :

ـ بەلێنیت دابوو تالووکەی نەکەی.راوەستـە بابەسەرهاتی کوتە نانێکت بۆبگێرمەوە.

ـ ئەمجار حەتمەن دەبێتە نان

لادێیی کوتی :

ـ بەلێ .ئەگەر ئاوردووت هەبێ ،تەنـدور دادەخەی .تینی ئاور نانەکەدەبرژێنێ و تـۆ دەتوانی نانەکەی لێکەیەوە وبیخۆی .

گورگ کوتی :

ئەگەر پاروەنانێک ئەو هەموو گێلمەگێلمە وزەحمەتەی هەبێ حاشا لە نان.

لادێیی کوتی :

ـ بۆ؟ تۆکە نانت پێ خۆش بووئەوەدەم کە خواردت کوتت زۆربەتامە ،چۆنە ئێستا دەڵێی حاشا لە نان ؟

گورگ کوتی :

ـ چونکە چەرمەسەری وکوێرەوەری یەکجار زۆرە ،لە هەموان خراپتر سەبروتاقەتێکی زۆری دەوێ تاکوو پەنجەیەکت نان وەدەست دەکەوێ ئەوەش خوویەکە کە دەئێمەدا نیە. شتێکم فێرکە کەبەهاسانی بتوانم سازی بکەم وبیخۆم دەنا لە برسان دەمرم .

لادێیی کوتی :

ـ بێ فایدەیە واباشترە تۆهەر گورگ بی ولە لێرەوار وبێروون‌دا بمێنیەوە کاتێک دەتەوێ وەک ئینسان نانی بخۆی دەبێ کار بکەی وتێ بکۆشی ،دەبی ئۆگری کاربی وکارت خۆش بوێ .

گورگ چاوێکی لە پیری لادێیی کرد ولەپڕ بە پڕتاو بەرەولێرەوار غاری داوە.

لە ڕێگادا لەبەرە خۆیەوە دەیکوت :

ـ ئەم ئینسانە بۆپاروەنانێک چەندە زەحمەت دەکێشی ،بڵێی هەرئادەمیزادێک بۆ نان پەیداکردن ئاوا زەحمەت بکێشێ !!؟ "

## مەتەڵ

هەتا نەیبەستی ناڕوا
"کاڵە"

مەلەدەکا ماسی نیە
دەخوێنێ بولبول نیە
دەشفڕێ و کوتر نیە
"قاز"

ژن نیە پیاویش نیە
بێدایک و بابیش نیە
"کێژ"

سەری بە نوێژە
بنی بە کوێژە
"گۆزە"

ئەوە جیە جی پێدەڵێن
تەپکە بەکونجی پێ دەڵێن
عەبای نارنجی پێ دەڵێن
بووکی مام حاجی پێ دەڵێن
"هەنجیر"

قافڵەی سەر زەمینێ
کاسبکاری بێزمان
"مێرووله"

هەڕەک و مەڕەک
نە پای هەیە نە دەست
دەکا هەر چوار گەڕەک
"دەستار"

# پەندی پێشینیان

- کێوێک دەرووخێ کە نداڵێک لێڕدەبێتەوە
- هەردەوە نەو دەبێ بەدار.
- هەر ئەو ساڵ خۆزگەم بەپار
- لە هەموو هەوران نا بارێ.
- زمانی براوە و سەری حەساوە
- دونیا بە هومێد خوراوە
- پارەی سپی بۆ رۆژی رەش
- ئینسانی حەسوود
  ناگا بەمەخسوود
- بەگوڵیان گوت بۆ واگەشی
  گوتی باخەوانم مەردە
- جیرانی خراپ پیاوی حاجەت داردەکا
- هەرچی پیوازی نەخوا
  چاوی نابرژێتەوە
  بزنی گروێ لە سەر چاوەی
  کانی ئاودەخواتەوە
- ئەگەر گوڵ نی دڕک مەبە.
- رێوی گەڕیدە لەشێری نوستوو
  جاترە.
- گەر نانێک بخۆی دەبێ عەقڵی
  لەتێکت هەبێ.
- دەستی زۆر ئاوێ بە هەورازیدا
  دەبا.
- ئەوەی لەمشک بێ هەمبانە
  دەبڕێ.
- کەوای سوور پلاوێ دەخوا.
- سواری کەری عەیبێکە.
  هاتنە خواری دووعەیبە.
- هێلکە دز دەبێ بە وشتر دز
- وشترە کە ببەستەوە.
  دوایە بڵێ بەهومێدی خودا
- بەکەرێ ناوێرێ
  بەکورتانی رەپەرە پی دێ
- مەڕ پێ لە بەرخی خۆی نانێ
- هەموو رۆژێ کەڵ نامرێ
  کفتە بە دووشایان بێ.
- چ مێوژێک چ کەویژێک.
- ئەگەر خەو جادە بوو
  کەروێشک بەگا دەبوو.
- گیا بە جێی سەختەوە دەمێنێ
- ئاسنی سارد بە فوو
  گەرم نابێ.
- عیسا بە دینی خۆی
  مووسا بە دینی خۆی
- شەرعی ماری بە داری.
- باوەڵێ باوێکی بەسە.
- جێگای مشکان کادێنە.
- سەرجۆبی یان دابەگامێشێ
  بۆلای کادێنێ دەکێشێ.
- داری هەڵێنی سەگی دز دیارە.

لێرەدا سپاسی دژوار خالیدعەزیز، سەلیم‌سوێناسی، نازدار غەفووری، عوسمان محەممەدی، عەباس ئاغابرا ئاوارە محەممەدیان، عوسمان خزرپەنا، زریان محەممەد کاکەیی، ئەختەر شیخەلئیسلامی، عەلی زالە، سەعید محەممەدزاردە دەکەین کەبۆ رازاندنەوەی ئەم بەشە یارمەتیان داوین.

ژنێک کچێکی دەبێ زۆری خۆش دەوێ هەموو جارێ دەڵێ ڕەبی قەزای تۆ بۆ من بێ و دەردت وە من کەوێ .

هەتا کچە نەخۆش دەکەوێ ڕۆژێکی مانگاکەیان سەری لە کووپەی دەگیرێ و هەرجی دەکا سەری نایەتەوە دەر . ناواروولە ژوورێ دەکا . ژنە زۆر دەترسێ و وادەزانێ عیزرائیلە دەڵێ :

- ئەمن ئەو نیم بە قوربان نەخۆشەکە لە ژوورێ یە . کچەکەمە !

## حاجی میرزاخان

کابرایەک لە شاهیندژ دەبێ حاجی میرزاخانی پێ دەڵێن ڕۆژێک یەکێک لە دانیشتوانی ئاوایی گاڵتەی لەگەڵ دەکا دەڵێ :

**- چون چوویە حەج بووی بەحاجی ، چون دەرست خوێندووە و سەوادت هەیە پێت دەڵێن میرزا ، چون زۆرت سەرەوت و سامان هەیە پێت دەڵێن خان . بەڵام نازانم ناوی خۆت چیە ؟ .**

کابرایەک گوێدرێژەکەی لەبەر دەرگای دووکانی سەلمانی یەک دەبەستێتەوە و وەژوور دەکەوێ لە سەر سەندەڵی یەک دادەنیشێ دەڵێ، کاکە ڕدێنم بۆ بتاشە سەلمانی. ڕدێنی کابرا ناخووسێنێ و بە وشکی بۆی دەتاشێ لەو کاتەدا گوێدرێژ دەسلەمێتەوە . سەلمانی دەڵێ . .

- ئەوە کەرەکەت بۆ هەڵات ؟

- دیتی چۆنم ئازار دەدەی لە خۆی ترسا .

دوودز دەچنە دوکانی خەیاتێک و دەڵێن :

- کاکە مۆدی کوت و شەڵواری ئەوساڵ چۆنە ؟

خەیات دەست پێدەکا و بۆیان دەگێڕێتەوە . یەکیان دەڵێ :

- ئەوەمان ناوێ . دەما ـ نەوێ بزانین گیرفان لە سەرەوە لێ دەندرێ یا لە بنەوە . با هەر لە ئێستا وەچارەی بکەین !

•••

- هەمەوەند مزگێنی !
زوو مزگێنی بدە ؟

- باشە! بەچاوان ! بۆ چی ؟

- کوڕەکەت لە کۆنکووری دانیشگا دەرچووە !

- پاە ! داخودا دەڵێم چ قەوماوە !

- چۆن پێت گرینگ نیە ؟ ڕوتبەی زۆر لە سەرەوەیە .

- بەرخی بابم کۆنکوور بۆتە " حەوت خوانی ڕۆستەم . " جارێ ئەوە خوانی هەوەڵە شەشی ماود .

- باشە بابە باشە نەمەویست ! مەیکە قیقەقیق . دەڵێی کەڵەبابی دەنکە نۆکت، دەگەرووی گیراوە !

تێبینی: لەبەر ئەوەی لە م جەدوەڵەدا هەموو ئوسووڵی ڕێنووسی کوردی بەپێی ڕێنووسی هەڵبژێردراوی ئەم گۆڤارە رەچاو کراوە، جگە لەوەی بیتانەی (ء) دانەنراوە. واتا ئەگەر بۆ وێنە وشەی (شر، کول، زۆر، شێر و ...)ی تێدا بێ بە شکڵی (شر، کول، زور، شیر و ...) دەنووسرێ.

١ـ پێک هاتنی هەنگاوێکی گرینگ بوو لە ڕێگای خزمەت بە زمان و فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی ٢ـ ئەوەندە بەفرە کە بە جارێک دەبارێ ـ بەم جۆرە ـ ویستنی لووت بەرزی یە ـ ناوێک بۆ کوڕ ٣ـ دەشتی بێ پیتی ئەغدە ـ کەوشەن ٤ـ زەمیری ملکی یە لەبن لەهجەی مەهابادیدا ـ زیت ووشیار ـ گیایەکی تاڵە ٥ـ دوایین پیتی ئەلف و بێ ـ تەنگەیەک لە ئەمریکا بەناوی دەریانەوەردێکی ئیسپانیایی یەوە کە بۆ یەکەم جار پێی زانیوە ـ بەرێوەیەوگوندە ٦ـ گوڵێکی جوانی خۆشبۆ ـ ئەگەر لەهجەیەک لەزمانی کوردی نەبێ لە کوردی زۆر نزیکە ـ گەورە ٧ـ پڕ ـ پێشگری فیعلی موزاریع ـ سەوزە وشیناوەرد ٨ـ دەنگی باڵندە ـ وێران وخاپوور ـ تووڕەیی وقین ٩ـ ردێن تاش ـ شاری چەند جار سووتاوی کوردستان ـ پێلاوسۆڵ ١٠ـ جێگای پێکەوە لکانی دوو شت ـ بەهاران سەیری "مێرۆژی" خۆشە ـ ڕەنگێکی تایبەتی ئەسپ و ماین ١١ـ گفت و گۆ ـ برای شوو ١٢ـ دەریاچە بەناوبانگەی کوردستان ـ کڵاوی هەمزە باڵەوان نە تکی هەیە نە درووما‌ن ١٣ـ تێکۆشان ـ خێڵ و ئێل ـ کورتە کاڵە ـ ١٤ـ دەڵێن ئی گورکە شانسە ـ حورمەت و ئیحترام ـ قیبلە ١٥ـ سەرەڕای جیاوازی لەهجەکان دەبێ بۆ پێک هاتنی تێ بکۆشین ـ زگی زل

١ـ فەرماندەری لەش ـ پێکەنینی کورت ٢ـ شەحسێکی بەناوبانگە و مەرقەدی لە جنووبی کوردستانە ـ بەرد بە شەیتان و شۆفار دادان ٣ـ شارێکی کوردە وبەکی ئینگلیزی ـ جۆرە ڕەوتێکی ئەسپ ـ وەرزشێکی قەدیمی هیندە ٤ـ بن لەهجەیەک لە شێوە ئاخاوتنی کوردی شیمال ـ کورسی دەوڵەمەندان ٥ـ شەتڵی شین بووە ـ شارەزای کار ـ چۆمی گەورە ٦ـ تەگبیر و ڕا ـ با نۆشی بێتە سەر ـ هەوایەکی بەسۆزی فۆلکلۆری ناوچەی جنووبی کوردستان ٧ـ چێشتێکی کوردەواری یە و ساردبووەکەی لە بێ تامیدا بەناوبانگە ـ شیری دڵدار ـ نەترە ٨ـ چۆک بە وشتر دادەدا ـ بۆی هەولێر ـ پاشماوەی سووری خەرمان ـ ئیمام حوسێنی کوشت ٩ـ زانایەکی ئەلمانی کە بۆ کۆکردنەوەی بەیتە کوردی یەکان زۆری زەحمەت کێشاوە وبەرهەمی کارەکەی پێشکەشی شای قەجەر کردووە ـ هاوکاری کەوان بۆ تیر دەرکردن ـ نیو تازە ١٠ـ نەنک و دایە گەورە ـ لە چەشنی ـ لق وپۆ ١١ـ تەشی فارس ـ بیدەیەوە نەتداوەتەوە ـ ناوچەیەک لە کوردستانی تورکیا ١٢ـ بن لەهجەیەک لە شێوە ئاخاوتنی جنووبی کوردستان ـ شاری حاجی قادر ١٣ـ زستانیش ئەی فەقیر دەدرێنێ ـ دەنگی تەیارە ـ ئەی شیری تا پیری ١٤ـ یاریڕێ لێ ون بوو ـ خۆماڵی بێ ناگیرێ ـ لەشکر و سپا ـ بلێسەی ئاگر ١٥ـ زاراوەی عێلی بادینان بیخۆ با نەتخوا ـ دەماری لەش.

| | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ | ١٠ | ١١ | ١٢ | ١٣ | ١٤ | ١٥ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | م | ە | ز | د | ە | ک | ■ | ح | ا | ت | و | و | ر | ی | ن |
| ٢ | ە | ە | م | ە | و | ە | ن | د | ■ | ە | ە | ی | ا | س | ە |
| ٣ | م | ر | ە | ■ | ز | ی | و | ە | ر | ■ | ح | ز | م | ■ | و |
| ٤ | ■ | ە | ە | ش | ■ | س | و | ■ | ک | ە | ت | ە | ■ | م | س |
| ٥ | ە | و | ر | ■ | پ | ا | ک | ■ | ە | ە | ■ | ■ | ر | ا | ن |
| ٦ | و | ە | ■ | ە | و | ن | ە | ر | ■ | ر | ا | و | ی | ڕ | ■ |
| ٧ | گ | ز | ر | ە | ■ | و | ن | و | و | س | ■ | ش | و | ی | ن |
| ٨ | ا | ■ | ن | و | ب | و | و | ک | ■ | ی | ە | ک | ا | ن | ە |
| ٩ | ن | ە | و | ا | ر | ■ | و | ر | ی | ن | ە | ■ | س | و | ز |
| ١٠ | ە | ە | و | ر | ■ | ت | ک | ا | ■ | ■ | س | ل | ■ | ■ | ێ |
| ١١ | ح | و | ■ | ێ | ە | م | ■ | و | ە | ج | ■ | ک | ە | س | ێ |
| ١٢ | و | ا | ■ | ح | ر | ا | پ | ■ | ە | و | ش | ■ | ە | و | ■ |
| ١٣ | و | ر | ی | ا | ■ | ش | ر | ی | ت | ■ | ە | ە | ر | ی | م |
| ١٤ | ت | ■ | و | ل | گ | ا | ■ | ە | ی | ر | و | ■ | ز | ن | ە |
| ١٥ | ■ | ت | ح | ی | ل | ■ | ب | ل | و | ق | ■ | ڕ | ە | ە | ر |

لەنێو ئەوکەسانەیدا کەپڕکراوەی دروستی ئەم جەدوەڵەمان بۆبنێرن بەپێی قورعەیەک کەس بەبەرەندە دەناسرێ. جایزەی بەرەندەی جەدوەڵ بریتی یە لەساڵێک ئابوونمانی گۆوارێ سروە. بەرەندەی جەدوەڵی ژمارە ٧ کاک سەلاح عەرەبی بوو.

**پڕکراوەی جەدوەڵی (٨)**

شینوێی سەردەشت

دیاری کاک مستەفا پوورمەند

هوڵوو

دیاری: وێنەگری شیوا (سنە)

کێوی تەرەغە

دیاری کاک خالیدی قەلعەکووهی (بۆکان)

دیاری کاک سەلاحی عەرەبی

سەوەچنین

دیاری کاک ئیبراهیمی ئەحمەدی